@ زنجیره کتێبی ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان kico ( 12 )

# بەرنامەی

# فۆتۆشۆپ

# Adobe photoshop 7.0 ME

نووسینی : ئاسۆ نادری – سوید

نووسینی پێشەکی و پێدا چوونەوەی : سەرکەوت پێنجوێنی

زنجیرە کتێبی دوانزەیەمی رێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان ( 12 ) kico

ناوی کتێب : بەرنامەی فۆتۆشۆپ

ناوی دانەر: ئاسۆ نادری – سوید

پێشەکیو پێدا چوونەوەی : سەرکەوت پێنجوێنی

سەرپەرشتیاری چاپ: ئارام محەمەد

چاپی : دووەم

تیراژ: 3000 دانە

نەخشەسازی بەرگ : kico

ناونیشانی رێکخراوی kico: بازاڕی هەورامان – نزیک بازاڕی خەفاف

www.kicoweb.com

kico@maktoob.com

Mobile: 07702220060

# لەم ژمارەیەدا

بەشی یەکەم : ناساندنێکی ئامڕازو لیستەکانی فۆتۆشۆپ
ئامرازەکانی فۆتۆشۆپ..................... 6
لیستی File ............................ 11
لیستی Edit ...................... 15
لیستی Image.................. 18
لیستی Layer .................. 21
لیستی Select ................ 25
لیستی Filter ........ 28
لیستی View ........ 31
لیستی Windows.........33
لیستی Help ......... 35
کردنەوەی پەڕەیەکی نوێ ...... 37
هەنگاوە کورتکراوەکانی فۆتۆشۆپ.......39
بەشی دووەم : وانە پراکتیکییەکانی فێربوونی بەرنامەی فۆتۆشۆپ
وانەی 1– تازەکردنەوەی وێنە کۆنەکان بەدوورێگا...... 41
وانەی 2– وێنە دەرهێنان لەفۆتۆشۆپدا ......48
وانەی 3– چینەکان Layer ....... 51
وانەی 4– نووسینی 3D لەفۆتۆشۆپ..... 62
وانەی 5 – ڕەنگی وێنەکەت بکە بەهەی‌نووسینەکەت .....67
وانەی 6– وێنە کۆن کردن ........70
وانەی 7–دروستکردنی ئالأیەکی راشەکاوە ......72
وانەی 8–چۆنییەتی دروستکردنی Barcode .... 75
وانەی 9– ڕووناککردنەوەی وێنە ....... 78
وانەی 10–شێوەکانی ناو فۆتۆشۆپ..... 81
وانەی 11–دروستکردنی پەڕەیەکی سووتاو ..... 86

وانەی12–گۆڕینی ڕەنگی چاو بەفۆتۆشۆپ....... 91
وانەی 13–چۆنیەتی هێڵ بڕین لەفۆتۆشۆپدا ...... 95
وانەی 14–ڕەنگدانەوە بۆفۆتۆشۆپ....... 101
وانەی 15– دروستکردنی ئیفێکتێکی جوان بەفۆتۆشۆپ.....105
وانەی 16– تێکەڵکردنی ڕەنگی دوو وێنە ....... 108
وانەی 17– گۆڕینی ڕاستییەکان لەفۆتۆشۆپدا .......111
وانەی 18– ئیفێکتی ماترێکس ....... 114
وانەی 19– چۆنییەتی دانانی فیلتەری نوێ بۆبەرنامەی فۆتۆشۆپ..... 118
وانەی 20 – ستایڵ دروستکردن لەفۆتۆشۆپ ....................122
وانەی 21 – کاریگەرییەکی جوان بۆنووسین بەفۆتۆشۆپ .......................127
بەشی سێیەم : سوود وەرگرتن لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ بۆدروستکردنی سایت
@ دروستکردنی ئەلبوومی وێنە بۆماڵپەڕی سایتەکەت ..... 131
@ دروستکردنی لینک بۆسایتەکەت ...... 134
@ دروستکردنی دووگمە بۆماڵپەڕ .......... 139

# پێشەکی

بەرنامەی فۆتۆشۆپ یەکێکە لەبەرنامە نایابەکان بۆکاری دیزاین و دەستکاریکردنی وێنە ,لەتەواوی جیهاندا بەملیۆنەها کەس کاری پێدەکەن ,بەشێوەیەك لەهەندێك جێیدا نەزانینی بۆتە عەیبە... فۆتۆشۆپ لەچاو بەرنامە وێنەییەکانی تر بەوەناسراوە بەخێرایی‌و جوانی کارەکان مەیسەرو چارەسەر دەکات ,ئەمە جگە لەوەی بەکارهێنان و تەنانەت فێربوونیشی ئاسانە .

ئەم کتێبەی بەردەستت هەوڵێکی ناوازەی هاوڕێی ئازیزم کاك ( ئاسۆ نادری ) یە لەسوید ,ئەو تەواو شارەزایە لەلایەنە گرنگەکانی بەرنامەی فۆتۆشۆپ ,بۆیە بەکارهێنەر دەتوانێت پشت بەم کتێبە ببەستێت بۆشارەزابوون لەفۆتۆشۆپ .خاڵی گەشی کتێبەکە لەوەدایە ئاسۆ هاتووە بەشێوەی وانەی پراکتیکی ,کەرێگایەکی زانستی سەردەمە فێری ئەم بەرنامەیەت دەکات ,نەك بەشتی تیۆری و نارِوون ...ئەو ئەندامی کارای گرووپی زانستپەروەرانی کوردستانە لەسوید z.kurd و وانەکانی لەوسایتەدا پەخشکردووە ...ئاسۆی نادری دۆستێکی دڵسۆزی گۆڤاری وێیەو بەردەوام بەبابەتی بەسوود بەسەریدەکاتەوە ...لەبواری itدا کاری جدی و دیاری ئە نجامداوە ,کەمایەی دەستخۆشی و خەڵات کردنە..دواجار دەستخۆشی لەنووسەری ئەم کتێبە دەکەم ,کەبەوشێوە کوردییە پەتییە جوانە کتێەکەی نووسیوەو زۆر وێنەی سرووشتی دلڕفێنی کوردستانی ئازیزو ئالأی کوردستان و مامە پیرەی یەکێك لەگوندە دڵگیرەکانی کوردستانی لە نموونەکانیدا پراکتیك کردووە ...هیواداریشم ئێوە بتوانن بەهۆی ئەم سەرچاوەیە کارەکانتان بەفۆتۆشۆپ جێبەجێ بکەن.

سەرکەوت پێنجوێنی

سەرۆکی رێکخراوی kico

sarkawt@paris.com

# ئامرازەکانی فۆتۆشۆپ

هەموو ئەو خاڵانەی خوارەوەت بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر نیشانکەری مشکەکەت ببەیتە سەریان و کەمێک ڕاییگری.

A

1، دیاری کردنی لاکێشەیی.

2، دیاری کردنی هێلکەیی.

3، دیاری کردن بە ڕیز.

4، دیاری کردن بە ئەستوونی.

5، کەرەستەی بڕین.

B

1، دیاریکردنی ئازاد.
2، دیاریکردنی گۆشەیی.
3، دیاریکردنی ئاڕنەبایی.

C

1، مۆری شووشەیی.
2، مۆری کێشراو .

D

1، فلچەی پاشکەوتکراوەکان.
2، فلچەی کێشان.

E

1، ئامرازی سڕینەوە.
2، ئامرازی سڕینەوە بەبێ ڕەنگ.
3، ئامرازی سڕینەوە بەڕەنگێکی دیاریکراو.

F

1، پێنووسی دارین.
2، هێڵ.

G

1، جوانکردن .
2، ڕوونکردنەوە .
3، پەنجە .

H
1، کەمکردنەوەی زۆری.
2، سووتاندن.
3، پەموویی.

I
1، پێنووس.
2، پێنووسی ئارپنەبایی .
3، پێنووسی ئازاد.
4، زیادکردنی نوختەیەک.
5، کەمکردنەوەی نوختەیەک.
6، دیاریکردنی ڕاستەوخۆ.
7، گۆڕینی نوختە.

J
1، تێکست.
2، سێبەری تێکست.
3، تێکستی ئەستوونی.
4، سێبەری تێکستی ئەستوونی.

K

1، پلەپێدانی هێڵی.
2، پلەپێدانی نوختەیی.
3، پلەپێدانی گۆشەیی.
4، پلەپێدانی ئارام . ڕێک.
5، پلەپێدان بە عەکسەوە .

L

1، تکێنەر.
2، هەڵسەنگاندنی ڕەنگەکان

## لیستەکانی فۆتۆشۆپ

**لێرەدا شەرحی یەکەیەکەی شریتی ئامرازەکانی بەرنامەی فۆتۆشۆپ دەکەین :**

# لیستی فایل File

File

| Command | No. | Shortcut |
|---|---|---|
| New... | 1 | Ctrl+N |
| Open... | 2 | Ctrl+O |
| Browse... | 3 | Shft+Ctrl+O |
| Open As... | 4 | Alt+Ctrl+O |
| Open Recent | 5 | ▸ |
| Close | 6 | Ctrl+W |
| Save | 7 | Ctrl+S |
| Save As... | 8 | Shft+Ctrl+S |
| Save for Web... | 9 | Alt+Shft+Ctrl+S |
| Revert | 10 | |
| Place... | 11 | |
| Import | 12 | ▸ |
| Export | 13 | ▸ |
| Workgroup | 14 | ▸ |
| Automate | 15 | ▸ |
| File Info... | 16 | |
| Page Setup... | 17 | Shft+Ctrl+P |
| Print with Preview... | 18 | Ctrl+P |
| Print... | 19 | Alt+Ctrl+P |
| Print One Copy | 20 | Alt+Shft+Ctrl+P |
| Jump To | 21 | ▸ |
| Exit | 22 | Ctrl+Q |

پێم وایە کە هەرکەسێک لە ئێمە پرۆگرامی فۆتۆشۆپی بەکاربردبێت بۆ چارەسەرکردن و دەستکاری کردنی وێنەکانمان، یان هەر هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کورتیش بووبینە هاورێی، دەزانین کە فۆتۆشۆپ چییە و چی پێدەکرێت. هەر بەشێک لە بەشەکانی فۆتۆشۆپ بۆخۆی خاوەنی هونەرێکی جوان و نهێنیەکی زۆرە، من تابتوانم و سەری لەبەر دەرکەم هەوڵ ئەدەم ئەو نهێنی و هونەرانە بڵاو کەمەوە .

هەوەڵین زنجیرە بابەت لەسەر لیستەکانی فۆتۆشۆپ دەبێت و ئەمەش هەوەڵین بابەتە کە یەکێک لە لیستەکانی فۆتۆشۆپم تێدا شیکردۆتەوە.
لیستەی File

1.New کردنەوەی پەڕگەیەکی نوێ لەگەڵ هەڵبژاردن و ڕێکخستنی پێداویستیەکانی پەڕگەکە. کورتکراوەی هەنگاو.Crtl+N
2.Open کردنەوەی پەڕگە وێنەییەکان، ئەوانەی کەلەنێو کۆمپیوتەر و سیدی و دیسک دان. کورتکراوەی هەنگاو .Ctrl+O
3.Browse پیشاندانی ڕێ و شوێنی وێنەکانت. کورتکراوەی هەنگاو Shift+Ctrl+O.
4.Open As لەڕێگەی ئەو فەرمانەوە دەتوانی فۆرماتێکی وێنە هەڵبژێریت و بتەوێ وێنەیەک بەو فۆرماتە بکەیتەوە، نموونە، بوخچەیەکت هەیەو سەدان وێنەی تێدایەو فۆرماتی وێنەکانیش جۆراوجۆرن، بەڵام تۆ دەتەوێ کە فۆرماتێک لە فۆرماتی ئەو وێنانەت پێ پیشان بدات، بۆیە لەوێدا تۆ دەتوانی خۆت فۆرماتێک هەڵبژێری و تەنیا وێنەی لەو فۆرماتەت بۆ پیشان دەدات. کورتکراوەی هەنگاو.Alt+Ctrl+O

5.Open Recentکردنەوەی دواترین پەڕگە کە لە فۆتۆشۆپ دا ئیشت تێدا کردوە یان دروستت کردوە.
6.Closeداخستنی ئەو وێنەیەی کە ئێستا لە فۆتۆشۆپ دا کراوەتەوە، فۆتۆشۆپ داوات لێدەکات ئەگەر بتەوێ گۆڕانکاریەکان پاشەکەوت بکەی یان نە، ئەوەش لەکاتێکدا دەبێت کە خۆت پێش دانی فەرمانی داخستن پاشەکەوتت نەکردبێت. کورتکراوەی هەنگاو.Ctrl+W
7.Saveپاشەکەوت کردنی وێنەکە وەک ئەوەی کە لەفۆتۆشۆپ ـە، بەهەموو گۆڕانکاری و هەنگاوە جێبەجێ کراوەکانەوە. کورتکراوەی هەنگاو.Ctrl+S
Save As.8.پاشەکەوت کردنی وێنە بەناوێک و فۆرماتێکی دیکەوە. کورتکراوەی هەنگاو.Shift+Ctrl+S
9.Save For Webپاشەکەوت کردنی ئیشەکەت وەک وێنەیەک بۆ وێب، ئەو ڕەنگانە بەکاردەبات کە لەسەر وێب بەکار دەبرێن. کورتکراوەی هەنگاو Alt+Shift+Ctrl+S.
10.Revertئەم فەرمانە دەتگەڕێنێتەوە بۆ دواترین شێوەی ئیشەکەت پێش پاشەکەوت کردن، بۆ نموونە، وێنەیەکت کردۆتەوەو چەند گۆڕانکاریەکت بەسەریدا هێناوە، بەڵام ئێستا پەشیمان بوویتەوەو دەتەوێ وێنەکە بگەڕێنیتەوە بۆ شێوەکەی خۆێ، بۆ ئەو مەبەستە دەتوانی ئەو فەرمانە بەکاربەری، بەڵام ئەگەر گۆڕانکاریەکت بەسەری وێنەکەدا هێنابێت و پاشان پاشەکەوتت کردبێت، ئەوا تاوەکو پاش ئەو پاشەکەوت کردنە شێوەی وێنەکەت بۆ دەگەڕێنێتەوە.
11.Placeهێنانە ناوەوەی ئەو پەڕگانەی کە بەم فۆرماتانەن ,AL, PDP PDF, EPSو لە پەڕەیەکی نوێدا دەیانکاتەوە.
12.Importبەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانی وێنەکانت لە سکانەر، وێنەگری دیجیتاڵ، کارتی تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ و ئەو شتانەی دیکە کە پێوەندیان بەم

ئیشەوە هەیە، پاشان دەتوانی ئەو وێنانەش بەو فۆرماتانەی کە پرۆگرامەکە سەپۆرتی دەکات، پاشەکەوت بکەیت.

13.Exportئیشی ئەمەش هەر وەک هی ئەوەی پێشووە بەڵام بە عەکسەوە، بەم فەرمانە دەتوانی وێنەکانت بنێریتە دەرەوە بۆ پرۆگرام و لایەنەکانی دیکەی پەیوەندیدار بەو بوارەوە.

14.Workgroupدەستکاری کردنی وێنەیەک لەسەر وێب، بەڵام دەبێ ناوونیشانی ڕاژەکارو نازناوو وشەی نهێنیتی پێ بدەی و پاشانیش دەتوانی وێنەکە دابنێیتەوە لە شوێنی خۆی.

15.Automateئەم خاڵە ئیشی زۆر گرینگ و جوانمان بۆ جێبەجێ دەکات ئەگەر دروست لەگەڵیدا بڕۆین، بۆ نموونە، گۆڕینەوەی پەڕگە لە فۆرماتی PDF ـەوە بۆ PSD و بەو شێوەش مانای وایە کەتۆ دەتوانی پەڕگەکە لە فۆراتی PDF ـــەوە بگۆڕی بۆ فۆرماتێک کە ئاسایی لەفۆتۆشۆپ دا دەستکاری دەکرێت، پاشان دەتوانی بیکەیتەوە لە خودی فۆتۆشۆپ دا و گۆڕانکاری بەسەر دابێنیت و وەک هەر وێنەیەکی ئاسایی پاشەکەوتی بکەی.

16.File Infoنووسینی هەموو جۆرە زانیاریەک کە لەداهاتوودا وەک پێناسەیەک بۆ وێنەکە لەقەڵەم دەدرێت.

17.Page Setupکردنەوەی پەنجەرەیەکی دیالۆگی بۆ ڕێکخستن و هەڵبژاردنی جۆری پەڕە. کورتکراوەی هەنگاو.Shift+Ctrl+P

18.Print With Previewجیاوازیەکی زۆر نییە لە نێوان ئەم فەرمانەو ئەوەی سەرەوەیدا، لێرەشدا دەتوانی بە شێوەیەکی وردتر شێوەی پەڕەکەت ڕێکخەی بۆ چاپکردن .کورتکراوەی هەنگاو.Ctrl+P

19.Printچاپکردن. کورتکراوەی هەنگاو.Alt+Ctrl+P

20.Print One Copyپەیوەندیدار بەو بوارەی پێشوو. کورتکراوەی

هەنگاو Alt+Shift+Ctrl+P.

21.Jump To گوێزینەوە بۆ پرۆگرامی Adobe Image Ready.

22.Exit دەرچوون لە پرۆگرامی ئەدۆب فۆتۆشۆپ. کورتکراوەی هەنگاو Ctrl+Q.

# لیستی Eidit

Edit

| Command | No. | Shortcut |
|---|---|---|
| Undo Type Tool | 1 | Ctrl+Z |
| Step Forward | 2 | Shft+Ctrl+Z |
| Step Backward | 3 | Alt+Ctrl+Z |
| Fade... | 4 | Shft+Ctrl+F |
| Cut | 5 | Ctrl+X |
| Copy | 6 | Ctrl+C |
| Copy Merged | 7 | Shft+Ctrl+C |
| Paste | 8 | Ctrl+V |
| Paste Into | 9 | Shft+Ctrl+V |
| Clear | 10 | |
| Check Spelling... | 11 | |
| Find and Replace Text... | 12 | |
| Fill... | 13 | |
| Stroke... | 14 | |
| Free Transform | 15 | Ctrl+T |
| Transform | 16 | ▸ |
| Define Brush... | 17 | |
| Define Pattern... | 18 | |
| Define Custom Shape... | 19 | |
| Purge | 20 | ▸ |
| Color Settings.. | 21 | Shft+Ctrl+K |
| Preset Manager... | 22 | |
| Preferences | 23 | ▸ |

1.Undoگەڕانەوە بۆ جێبەجێ نەکردنی هەنگاوی پێشوو، دواترین هەنگاو کە جێبەجێ کردوە، بۆ نموونە، دەستکاری وێنەیەکت کردووە، دەتوانی کە دواترین هەنگاو جێبەجێت کردوە، بیسڕیتەوە Ctrl+Z .
2.Step Forwardهەنگاوێک چوونە پێشەوە Shift+Ctrl+Z .
3.Step Backwardهەنگاوێک بۆ دواوە Alt+Ctrl+Z .
4.Fadeئیشی ئەم فەرمانە زۆر جوانە، بۆ نموونە، بەشێکت لە وێنەیەکت ڕەنگ کردوەو دەتەوێ بزانی کە جیاوازی بەشە ڕەنگکراوەکەو بەشە ئەسڵیەکە چییە! ئەو کاتە دەتوانی لەم فەرمانە سوود وەرگری .
Shift+Ctrl+F

5. بڕین، بڕینی وێنەیەک لە پەنجەرەیەک بۆ پەنجەرەیەکی دیکەوە، بڕینی بەشێکی دیاریکراو لە وێنەیەک Ctrl+X .
6.Copyلەڕونووسینەوە Ctrl+C .
7.Copy Mergedلەڕونووسینەوەی بەشێک، بۆ نموونە، دەتەوێ بەشێکی تایبەت یان دیاریکراو لە وێنەیەک ڕونووس بکەیتەوە، ئەو کات دەبێ بەئامرازی دیاریکردن بەشەکە دیاری بکەیت و پاشانیش لەم فەرمانە سوود وەرگری بۆ لەڕونووسینەوەی Shift+Ctrl+C .
8.Pastلکاندن، لکاندنی ئەو بەشە یان ئەو وێنەیەی کە ویستت لەڕوی بنووسیتەوە Ctrl+V .
9.Paste Intoلکاندنی وێنە، بەڵام بە شێوەیەک کە هیچ شتێک لە وێنە ئەسڵیەکە نەگۆڕێت Shift+Ctrl+V .
10.Clearسڕینەوەی بەشی دیاریکراو لە وێنەی چالاک .
11.Check Spellingڕاستکردنەوەی نووسینەکانت ئەگەر هەڵەیان تێدابێت.
12.Find and Replace Textدۆزینەوەو دەستکاری کردنی

نووسینەکان.

13.Fill پڕکردنەوە بەو نەقشەی کە لە فەرمانی Define Pattern دا هەڵیدەگری، تەواوکەری فەرمانی ناوبراوە.

14.Stroke چاوەدێری کردنی زلی و ناسکی هێڵەکان.

15.Free Transform لە ناوی فەرمانەکەوە ڕوونە کە ئیشەکەی چییە، هاوردن و بردنی وێنە بەهەر لایەکدا کە دەتەوێ Ctrl+T .

16.Transform هەمان هەنگاوی سەرەوە، بەڵام دابەش کردوە بە سەر چەند بەشێکدا و هەر بەشێک ئیشێک لە ئیشەکانی فەرمانی سەرەوە جێبەجێ دەکەن.

17.Define Brush دروستکردنی فرچە، بۆ نموونە، دەتەوێ فرچەیەکی تایبەت بۆ خۆت بە پێی پێداویستیەکانت دروست بکەی، دەبێ بەشێک لە وێنە دیاری بکەی و پاشان لەم هەنگاوە کەڵک وەرگری بۆ دروستکردنی فرچەکە.

18.Define Pattern پڕکردنەوە، هەڵگرتنی وێنەیەک یان بەشێک لە وێنەیەک و پاشان دەتوانی ئەو وێنەیە وەک شێوەیەکی پڕکەر بەکار ببەیت و ئەم فەرمانەش بەستراوەتەوە بە فەرمانی Fill ـەوە، کە لەسەرەوە شیکراوەتەوە.

19.Define Custom Shape دروستکردنی شێوەی ئامادە بۆ دانانی وەک نەقشێک .

20.Purge هەر هەنگاوێک کە لە فۆتۆشۆپ دا جێبەجێ دەکرێت، هەڵدەگیردرێت، ئیشی ئەم فەرمانە سڕینەوەی ئەو هەنگاوانەیە بۆ ئازادکردنی بەشی زیاتر لە مێشکی پرۆگرامەکە.

21.Color Settings ڕێکخستنی ڕەنگی چاپکەر، ئەم هەنگاوە کەم بەکار دێت لە لایەن وێبداڕێژانەوە Shift+Ctrl+K .

22.Preset Managerچاوەدێر کردنی هەموو بوارەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ ڕەنگ و فرچەکانی پرۆگرامەکە.

23.Preferencesڕێکخستنی ئەدوق فۆتۆشۆپ بەو شێوەیەی کە بەکار هێنەر دەیەوێت.

## لیستی Images

1.Modeلەڕێگەی ئەم فەرمانەوە دەتوانی دەستکاری و ڕێککردنی سیستەمی ڕەنگەکانی وێنە بکەی.
2.Adjustmentsلێرەدا دەتوانی بەشێوەیەکی جوان و ڕێکوپێک دەستکاری ڕەنگی وێنە بکەیت، بەتایبەت ئەگەر بتەوێ دەستکاری ڕەنگی ئەسڵی وێنە بکەی.
3.Duplicateلەڕێگەی ئەم فەرمانەوە دەتوانی رونووسێک لە ئیشەکەت بکەی بەگشتی بۆ هەڵگرتنی نموونەیەک بۆ کاتی پێوست .
4.Apply Imageزیاتر وەدەرخستنی بەشێک لەوێنە لەو بەشەکەی دیکەی .
5.Calculationهەمان فەرمانی پێشوو بەڵام بەشێوەیەکی وردتر و ڕێکووپێک تر.
6.Image Sizeهەنگاوێکی زۆر زۆر گرینگە چونکە پێوەندیدارە بەقەبارەی وێنەو ڕوونیەوە لەگەڵ ڕێککردنی پیکسلەکانی وێنە.
7.Canvas Sizeگۆڕینی قەبارە، پانی و بەرزی، بەڵام پانی و بەرزی پەردەی پشت وێنەت بۆ دەگۆڕێت.
8.Rotat Canvasگۆڕین بەپێی گۆشە، تاقی کەرەوە بۆ باشتر شارەزا بوون لە ئیشەکەی.
9.Cropبڕینی بەشی دیاریکراو لە وێنە، بەبێ ئەوەی کە هیچ گۆڕانکاریەک بکات لە ڕەنگ و تایبەتمەندیەکانی وێنەکەدا.
10.Trimڕێککردنی قەراغی وێنە.
11.Reveal Allڕێککردنەوەی قەبارەکان، بۆ نموونە، ئیشێکی نوێت دەستپێکردوەو دەتەوێ وێنەیەک بێنیتە نێو ئەم ئیشەت، بەڵام قەبارەی وێنەکە لە قەبارەی ئێشەکەت گەورە ترە بۆیە هەموو وێنەکەت پیشان نادرێ ئەگەر قەبارەی ئیشەکەت لە هی وێنەکە گەورەتر نەبێت. تۆش دەبێ

**پەڕەیەکی نویٚ بکەیتەوە بە قەبارەیەکی گەورەتر لە هی ویٚنە بۆ ئەوەی ویٚنەکەت بەتەواو پیٚ پیشان بدات، بەلاٚم ئەم فەرمانە ئەو هەنگاوەت بۆ پشت گویٚ دەنیٚت و خۆی بەیەک کرتە قەبارەی ئەو پەڕەیەی کە ویٚنەکەی تیٚ دەبەی گەورە دەکات بەقەد هی ویٚنەکە، بەو شیٚوەش ویٚنەکەت بە تەواو جیٚی دەبیٚتەوە.**

**12.Histogram ئەو فەرمانە پلەی ڕەنگەکانی سەر ویٚنەت بۆ دەردەخات.**

**13.Trap ئەم فەرمانە دەتوانیٚ کاریگەری هەبیٚت لەسەر ئەو ویٚنانەی کە بۆ چاپکردنن و هیچ ڕۆڵیٚک نابینیٚ لەسەر ویٚنەکانی تایبەت بە ویٚب**

# لیستی Layer

Layer
New 1
Duplicate Layer... 2
Delete 3
Layer Properties... 4
Layer Style 5
New Fill Layer 6
New Adjustment Layer 7
Change Layer Content 8
Layer Content Options... 9
Type 10
Rasterize 11
New Layer Based Slice 12
Add Layer Mask 13
Enable Layer Mask 14
Add Vector Mask 15
Enable Vector Mask 16
Group with Previous 17 Ctrl+G
Ungroup 18 Shft+Ctrl+G
Arrange 19
Align Linked 20
Distribute Linked 21
Lock All Layers In Set... 22
Merge Down 23 Ctrl+E
Merge Visible 24 Shft+Ctrl+E
Flatten Image 25
Matting 26
ZKURD.ORG

Layer = چین

New .1ئەم فەرمانە چینێکی نوێت بۆ دەکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا چەند شێوەیەکی چینی لە خۆ گرتووە.

Duplicate Layer .2لەڕونووسینەوەی چینی چالاک.

Delete .3سڕینەوەی چین.

Layer Properties .4تایبەیمەندیەکانی چین.

Layer Style .5گۆڕینی تایبەتمەندیەکانی نووسینەکانی نێو چینەکە و چەندیان شتی دیکەی لەو بابەتە، بۆ نموونە، دەستکاریکردنی ڕەنگەکان بە پێی پلە. ...

New Fill Layer .6کردنەوەی چینێکی نویَ، بەڵام ڕووەکەی ڕەنگکراوە بەڕەنگێک، ڕەنگی پلەیی یان هەڵبژاردنی شێوەیەکی پێشتر دروستکراو، بۆ دروستکردنی ئەو شێوەش لە فەرمانی Define Pattern لە لیستەی Edit هەیە، ئەم چینە ناتوانریَ بجووڵێتەوە پاش پێکهێنانی.

New Adjustment Layer .7ئەم فەرمانە چینێکی نویَ پێکدێنێت و چەند تایبەتمەندیەکی دیکەی تێدایە کە لە فەرمانە ناوبراوەکاندا نەبووە، ئەم فەرمانە هەلی ئەوەت بۆ دەڕەخسێنیَ کە بەتەواوی و بەئارەزووی خۆت بواری ڕەنگ و ڕووناکی و چەماندنەوەو چەندین شتی دیکە جێبەجیَ بکەی.

Change Layer Content .8ئاڵوگۆڕ هێنان بەسەر ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە دوو هەنگاوی ڕابوردوودا جێبەجێت کردوون لە سەر چین.

Layer Content Options .9خێراتر دەتباتە سەر ئەو ئاڵوگۆڕیانەی کە بەسەر چینەکەدا هێناوتە لە ڕێگەی هەنگاوە ناوبراوەکانی سەرەوە.

Type .10بۆ ئەوەی ئەم فەرمانە چالاک بێت، دەبیَ نووسینێکت نووسیبێت لە سەر وێنەکە یان کە نێو چینەکەدا، ئیشی ئەم فەرمانە هەمووی

له بواری گۆڕین و دەستکاریکردنی شێوەی نووسینەکانە.

11. Rasterize ئەم فەرمانە دەتوانی نووسینەکانت بۆ بنێتە نێو چینێکی نوێوە بۆ ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕ هێنان بەسەریاندا.

12. New Layer Based Slice ...

13. Add Layer Mask ئەم فەرمانە لەسەر چینێکی وێنەیی کاریگەری دەبێت نەک لە سەر چینێکی ڕەنگراو .بەشێکی تایبەت دەکاتەوە کە ناوەڕۆک و دەمامکی (Mask) چینی دیاریکراو لە خۆ دەگرێت.

14. Enable Layer Mask دانان و لابردنی گاریگەریەکانی هەنگاوی پێشوو، بۆ ئەوەی کە بەڕوونی دەرکەوێت جیاوازی چی بووە کە ڕوویداوە.

15. Add Vector Mask ...

16. Enable Vector Mask ...

17. Group With Previous چینی چالاک و چینی پێشووی دەکات بە یەک گرووپ.Ctrl+G .

18. Ungroup ناچالاک کردنی هەنگاوی ئەنجامدراوی پێشوو.

19. Arrange ڕێککردنی چینە دروستکراوەکانی سەر وێنە، ئەم فەرمانە تەنیا لە کاتێکدا بەکاردێت کە چەند چینێک لە سەر وێنە دروستکرابێت.

20. Align Linked ئەم فەرمانە چینەکان لێکتر نزیک دەکاتەوە! .

21. Distribute LInked زۆر جیاوازی نییە لە گەڵ ئەوەی سەرەوەی.

22. Lock All Layer In Set دەتوانی بۆ داخستن و یان ناچالاک کردن ئیشکردن لەسەر دوو چینی پێکەوە بەستراو، ئەم فەرمانە بەکار ببەیت.

23. Merge Down تێکەڵاوکردنی دوو چین، چینی چالاک و چینی خوارەوەی.

24. Merge Visible پێکەوە لکاندنی هەموو چینەکان، بە چاوپۆشی کردن لەوەی کە ئێستا چالاکەو ئیشی لەسەر دەکرێت.

25. Flatten Imageئەم فەرمانە هەموو چینەکانت بۆ دەکاتە یەکێک، و هەموویان وەی یەک وێنە و وەک یەک پەڕگە لێکدەلکێنێت، ئەم فەرمانە یاریدەرێکی چاکە بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی وێنە، چونکە بەشێوەیەکی گشتیی چینەکانی دەکات بە یەکێک.

26. Mattingسوودی ئەم فەرمانە ئەوەیە کە دەتوانین قەراغی وێنەکە یان چینەکەی لەگەڵ ڕێککەین.

هیوادارم بە سوود بووبێت.

*ئەو خاڵانەش کە هیچیان بۆ نەنووسراوە، پێویستیان بەکاتی زیاتر هەیە بۆ وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی، هیوادارم کە ئەوانیش لە داهاتوویەکی نزیکدا چارەسەر بکرێن.

## لیستی Selecte

1. All دیاریکردنی گشتیی، بەو فەرمانە دەتوانی هەموو بەشەکانی ئیشی چالاک دیاریبکەیت و پاشان لە ڕونووسینەوە لکاندندا سوودی لێوەربگری . Ctrl+A.

2. Deselect هەڵوەشاندنەوەی دیاریکردن. Ctrl+D .

3. Reselct دوبارە دیاریکردنەوە، لەکاتێکدا ئەم فەرمانە چالاک دەبێت کە هەنگاوی دیاریکردنی گشتییت جێبەجێ کردبێت و پاشان هەڵتوەشاندبێتەوە،

ئەو كات ئەم فەرمانە بۆت دياريدەكاتەوە، .Ctrl+Shift+D
4. Inverse لاسايى كردنەوەى بەشى دياريكراو، بەشێك لە وێنەيەك دياری بكە، پاشان ئەوە فەرمانەی لەسەر تاقيكەرەوە، دڵنيام باشتر دەيناسيت .Shift+Ctrl+I .
5. Color Range دياريكردن بەپێی ڕەنگ، بۆ نموونە، وێنەيەكی ڕەنگيت هەيەو دەتەوێ بەشێك كە ڕەنگێكی تايبەتی هەيە دياری بكەی و لە هەمان كاتدا ڕەنگەكان زۆرن، لەو بارەدا دەتوانی سوود لەم فەرمانە وەرگری و دڵنيام كە ياردەرێكی باش دەبێت .
6. Feather ياردەرێكی چاك و چالاكە بۆ تێكەڵاوكردنی ڕەنگی قەراغی بەشی دياريكراو لە گەڵ ڕەنگی بەشەكانی ديكەی وێنە، چونكە پشت بەستە بە پيكسل لە هەڵسوڕاندنی ئيشەكەی خۆيدا، .Alt+Ctrl+D
7. Modify ئەم فەرمانەش ئيشەكەی بەسوودە، دەتوانی لە ڕێگەی فەرمانی ناوبراودا بەشێك لە وێنە دياری بكەيت و پاشان قەراغ و پانی و ،،، بۆ ئەو بەشە دياريكراوە دابنێی .
8. Grow زيادكردنی بەشی دياريكراو، بۆ نموونە، كاتێك بەشێك لە وێنەيەك دياری دەكەی و لەو بەشەدا نووسينێكی بەر كەوتوە كە ڕەنگی ڕەشی هەيە، و لە وێنە گشتييەكەشدا لە هەمان ڕەنگ هەيە، دەتوانی ئەم فەرمانە بەكار ببەی بۆ دياريكردنی ئەو ڕەنگانەی كە لە يەك دەچن و لە يەكەوە نزيكن .
9. Similar هەمان فەرمانی سەرەوە، بەڵام ئيشەكەی Similar كورت نەكراوەتەوە لە چوارچێوەيەكی دياريكراوداو هەموو ئەو بەشانەی كە لە بەشی دايريكراو دەچن، دەخاتە سەر بەشە دياريكراوەكە .
10. Transform Selection دەستكاريكردنی بەرزی و پانی بەشی دياريكراو بەبێ ئاڵوگۆڕ هێنان بەسەر پيكسلەكانی بەشە دايريكراوەكەدا .

11. Laod Selection بارکردنی بەشی دیاریکراوی پاشەکەوتکراو .

12. Save Selection پاشەکەوتکردنی بەشی دیاریکراو، دەتوانی لەم فەرمانە سوود وەرگری کاتێک کە لەسەر بەشێکی تایبەت لە وێنەیەک ئیش دەکەیت، ئەو بەشە کە ئیشی لە سەر دەکەیت دیاری بکە و پاشان کرتەیەک بکە سەر ئەم فەرمانەو پاشەکەوتی ئەو بەشە بکە، ئەگەر کێشەیەکت بۆ پێشهات و ویستت وێنەکە بگەڕێنیتەوە سەر حاڵی خۆی دەتوانی لە فەرمانی Laod Selection سوود وەرگری و بەشە پاشەکەوتکراوەکە جارێکی دیکە لە شوێن خۆیدا دابنێیتەوەو پینەکانی سەر جێگە دەستکاریکراوەکەی پێ بدرویتەوە.

# لیستی Filter

1. Last Filter دانانی کاریگەری دواترین فیلتەر کە جێبەجێت کردوە لەسەر وێنە. Ctrl+F .

2. Extract دەرهێنان، ئەم فەرمانە زۆر سوودی هەیە، یەکێک لەو ئیشانە کە لە ئەم فەرمانە جێبەجێی دەکات جیاکردنەوەی وێنەیە لەگەڵ ڕەنگی

پشتەوەی .Alt+Ctrl+X .

3. Liquify.جوڵانەوەی وێنە و گۆڕینی لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دیکە، دەتوانی چاوێک لەم وانەیە بکەی کە پێشتر بڵاوم کردۆتەوەو ئیشی ئەم فەرمانەت بۆ ڕوون دەکاتەوە .Shft+Ctrl+X .

4. Pattern Maker.نموونە دروستکەر، دەتوانی بەشێک لەوێنەیەک دیاری بکەیت و پاشان بەم فەرمانە دوبارە یان نموونە نووسی بکەیتەوە . Alt+Shft+Ctrl+X.

فەرمانەکانی دیکەی ئەم لیستەیە، بۆ خۆیان چەند پەلێکیان هەیە، من لێرەدا ناوی سەر پەلەکان دەنووسم و ڕوونی دەکەمەوە کە ئیشی ئەو فەرمانە بە بەشەکانیەوە چیە 5. Artistic.□ !بەشەکانی ئەم فەرمانە پەیوەدیدارن بە بواری هونەری و ڕەنگکاری وێنە .

6. Blur.لێڵ کردن، لێڵ کردنی وێنە، دەتوانی بەشێک لە وێنەیەک لێڵ بکەیت بەشێوەیەک کە بینینی شتێکی ئاسان نەبێت .

7. Brush Stroke.چەند شێوەیەک و فەرمانێکی تایبەت بە بواری فرچە، ڕەنگکردن و سێبەر دروستکردن و چەندین شتی دیکە .

8. Distort.شێواندن و دانانی کاریگەری جۆراوجۆر لەسەر وێنەکەن بەبێ ئاڵوگۆڕ هێنان بەسەر ڕەنگی وێنەدا، بەڵکو گۆڕانکاری لە پیکسلەکانی وێنەدا دەکات .

9. Noise.هەژاندنی ڕەنگی سەر وێنە .

10. Pixelate.گۆڕینی ڕەنگ بە پێی پێکسلەکانی وێنە .

11. Render.ئەم فیلتەرە شێوەیەکی بە گشتیی نوێ دروست دەکات لەسەر وێنە، گۆڕانکاریەکی زۆر زۆر دێنێ بەسەر وێنەدا .

12. Sharpen.زیاتر ڕوونکردنەوەو جوانتر پیشان دانی وێنە، ئەم فیلتەرە گاریگەریەکی زۆر چاکی دەبێ لەسەر ئەو وێنە فۆتۆگرافیانەی کە

جوان ڕوون نین و پێویستان به دەستکاریه .

13. Sketch جێگری پێنووسی وێنەکێش، ئەم فەرمانه ئەو کاریگەریانەت بۆ دەخولٚقێنێ که هونەرمەندێکی وێنەکێش لەسەر وێنەکانی دایدەنێت .

14. Stylize هەموو بەشەکانی ئەم فیلتەره پێیان دەگوترێ گاریگەره ڕاستیەکان، چوونکه گاریگەری ئەم فیلتەره لەسەر وێنه بەشێوەیەکی جوان و نزیک له ڕاستی دەچێت .

15. Textuse دانانی شێوەی دەقی لەسەر وێنەکان .

16. Video دانانی گاریگەری تایبەت به شێوازی ڤیدیۆیی .

17. Other ئەم بەشه بریتیه له چەند فیلتەرێکی جۆراوجۆر که سەر به هیچ لەئەو خالاٚنەی سەرەوە نین .

18. Digimarc دانانی ناسایيەکی ئەلێکترۆنی بۆ وێنه، بەسوودە بۆ ئەو وێنانەی که له ماڵپەڕدا دادەنرێن و مافی لەچاپدانی وێنەکه دەردەخات.

## لیستی View

View = پیشاندان .

1. Proof Setup پیشاندانی وێنە بەزیاتر لەیەک شێوە ڕەنگ .

2. Proof Colors شتێکی وەک ئەوەی سەرەوە .Ctrl+Y

3. Gamut Warning

4. Zoom In. گەورەکردنەوەی وێنە بۆ باشتر بینینی، هیچ ئاڵوگۆڕیەک بەسەر قەبارەکەیدا ناهێنێت و وەک خۆی دەمێنێتەوە ++Ctrl .
5. Zoom Out. بچووککردنەوەی وێنە، ئەمەش هیچ ئاڵوگۆڕیەک بەسەر قەبارەدا ناهێنێت -+Ctrl .
6. Fit To Screen. پڕ بە گەورەیی پەنجەرەی پرۆگرامەکە .Ctrl+0 .
7. Actual Pixels. گەورەیی ڕاستی، ئەم فەرمانە شێوەو قەبارەی وێنەکەت بۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئەسڵی خۆی .Alt+Ctrl+0 .
8. Print Size. پیشاندانی وێنە بەو شێوەیەی کە لە چاپکردندا دەردەچێت .ئەم فەرمانە ڕۆڵێک و سوودی زۆری نییە بۆ ماڵپەڕ دروستکەرەکان .
9. Extras. پیشاندان بە باشترین شێوە .Ctrl+H .
10. Show. ئەم فەرمانە چەند خاڵێکی لە خۆ گرتووە: بۆ نموونە وەدەرخستنی هێڵ لە سەر وێنە، بۆ باشتر پیشاندانی بەشە جۆراوجۆرەکانی وێنەکە. چەند فەرمانی دیکەش، خۆت تاقیان بکەوە بۆ ئەوەی چاکتر تێبگەی کە ئیشیان چییە .!
11. Rulers. وەدەرخستن و شاردنەوەی خەتکێش .Ctrl+R .
12. Snap. ____ .
13. Snap To. ______ .
14. Lock Guides. لە کاتێکدا دەتوانی لەم فەرمانە سوود وەربگریت کە هێمایەک یان شێوەیەکت لە سەر وێنە دانابێت و بتەوێ نەجووڵێ Alt+Ctrl+;.
15. Clear Guides. سڕینەوەی فەرمانی جێبەجێکراوی سەرەوە .
16. New Guide. ڕێوشوێنێکی نوێ .

17. Lock Slices نەجووڵانەوەی بەشێک .
18. Clear Slices سڕینەوەی بەشێک.

## لیستی Windows

وەک بۆ هەمووان ڕوونە کە فۆتۆشۆپ پرۆگارمێکی زۆر بەنرخ و نایابە، هەر بەشێک لە بەشەکانی ئەم پرۆگرامە هونەرێک و شتێکی تێدایە کە دەتوانین فێربیین و پاشانیش بۆ دوارۆژ بەکاری بەرین و سوودی لیَ ببینین، لە وانەکانی پێشوودا هەموو لیستەکانی فۆتۆشۆپ ـم بە پێی توانا ڕوونکردەوە و ئەمەش دەتوانم بلێم کە دواترین لیستەن کە لەم بابەتەدا باسیان لێدەکەم. بەڵام ئەم دوو لیستەیە وەک ئەوانی پێشتر سوودێکی زۆریان نییە، چوونکە بواری هونەریان دەوڵەمەند نییە، لیستەی Window کە تایبەتە بە بواری ڕێککردنی پەنجەرەکانی نێوەوەی پرۆگرامەکە بۆ دابینکردنی باشترین و خەڵوەتترین شوێن بۆ پیشاندانی ئیشەکانت و ئاسانی کردنی ئیشەکانت. هەموو خاڵەکانی ئەم لیستەیە پەیوەندیدارن بەو ئیشەوە، بۆیە بە پێویستم نەزانی کە هەموویان شی بکەمەوە.

# لیستی Help

= Helpیارمەتی .

لیستەی Help تایبەتە بە یارمەتیەکانی فۆتۆشۆپ، پێم وانییە کە هیچ کەسێک تا ئێستا بەدوای ئەم لیستەدا چووبێت، لەم لیستەدا یارمەتیە سەرەکیەکانت دەست دەکەوێت و ئەگەر یارمەتی سەرەکیت پێویست بوو دەتوانی چاوبکەی لەو لیستەیە

@بۆئەوەی لەپاڵ ئەم کتێبەدا زانیاری زیاتر لەسەر بەرنامەی فۆتۆشۆپ وەربگریت ،گۆڤاری وێب بخوێنەرەوە ... وێب گۆڤارێکی تایبەتە بەئینتەرنێت و کۆمپیوتەر... مانگانە لەشاری سلێمانی دەردەچێت و سیدی تایبەتی لەگەڵدایە ..

# کردنەوەی پەڕەیەکی نوێ

ئەم بابەتە بریتیە لە چۆنیەتی کردنەوەی پەڕگەیەکی نوێ لە فۆتۆشۆپ دا،
هەر وێنەیەک کە تۆ لە فۆتۆشۆپ دا دروستی دەکەیت و دەستکاری دەکەیت،
مەبەستێکی لە دواوەیە یان بۆ شتێکی تایبەت دروستی دەکەی، بۆ نموونە
وێنە بۆ وێب و بۆ چاپکردن و هتد ...
هەر یەک لەو جۆرە وێنانە پێویستی بە تایبەتمەندی تایبەت هەیە بۆ ئەوەی
بە جوانترین و باشترین شێوە بە ئەنجام بگات .
کردنەوەی پەڕگەیەکی نوێ،
پاشانFile New یان Ctrl+N کرتە بکە، پاشان پەنجەرەیەکی وەک
ئەمەی خوارەوەت بۆ دێتە پێشەوە:

1: Name ناو، لەوێدا ناوێک دەنووسریٚ بۆ وێنەکە .

2: Preset Sizes قەبارە دیاریکراوەکان، لێرەدا فۆتۆشۆپ بۆ خۆی ئەو قەبارانەی کە شتێکی دیارین و زۆر بەکار دەبرێن دایناون .

3: لێرەش دا دەتوانی بۆ خۆت پانی و بەرزی بنووسی .

4: Resolution لێرەدا بەمانای جوانی و هەرچی باشتر کردنی ڕەنگەکانی وێنە دێت و دەبێت بە ئینج بێت .

5: Mode شێوەی وێنە، لێرەدا دەتوانی تایبەتمەندیەک بۆ وێنەکەت دیاری بکەی کە لەگەڵ مەبەستی دروستکردنی وێنەکەت بگونجیٚ، بۆ نموونە ئەگەر بتەویٚ وێنەیەک بە بەرهەم بێنی کە بۆ ماڵپەڕ و ئیشی لەو بوارە بەکاری ببەی، ئەوە دەبیٚ RGB Color هەڵبژێری .

6: Contents شێوەی یان ڕەنگی پشتەوەی وێنەکە

# هەنگاوە کورتکراوەکانی فۆتۆشۆپ

1. Ctrl+ Sپاشەکەوتکردن.
2. Ctrl+ Nکردنەوەی پەڕەیەکی نوێ.
3. Ctrl+ Oکردنەوەی پەڕگەیەکی نێو کۆمپیوتەر.
4, X+Ctrlبڕین.
5. Ctrl+ Pچاپکردن.
6. Ctrl+ Cڕونووس.
7. Ctrl+ Vلکاندن، چەسپاندن.
8. Ctrl+ Tکۆنترۆڵ کردنی قەبارە.
9. Ctrl+ Iعەکسکردنەوەی ڕەنگەکان.
10. Ctrl+ Uگۆڕینی ڕەنگەکان.
11. Ctrl+ Aدیاریکردنی گشتیی.
12. Ctrl+ Fدووبارە کردنەوەی دواترین هەنگاو لە فیلتەرەکاندا.
13. + + Ctrlگەورەکردنەوە.
14. - + Ctrlبچووککردنەوە.
15. Ctrl+ 0پیشاندانی ئیشەکەت بەباشترین شێوە.
16. Bفرچەکان.
17. Vگواستنەوەی شێوە.
18. Uکێشانی شێوە ، چوارگۆشە، بازنە،،، هتد
19. Zگەورەکەر، زەڕەبین.
20. Iتکێنەر.
21. Lدیاریکردن.
22. Wچێوی دیاریکردن.
23. E سڕێرەر ، کوژێنەر.
24. Tدەستکردن بەنووسین

# وانە پراکتیکییەکانی فۆتۆشۆپ

## وانەی 1

## تازەکردنەوەی وێنە کۆنەکان –ڕێگەی 1

لێرەدا چۆنیەتی نوێکردنەوەی وێنە کۆنەکان شێدەکەمەوە، کە بە دوو هەنگاوی ئاسان جێبەجێ دەکرێت،
پێش هەموو شتێک وێنەکی کۆن بکەوە،(مەرج نییە کە کۆن بێت، بەڵام دەبێت ڕەنگەکەی ڕەش و سپی بێت(!
من ئەمەم کردۆتەوە:

دەستبنێ بە Ctrl و U دا لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت و لەو پەنجەرەیەی کەبۆت دەکرێتەوە هێمایەکی ڕاست دابنێ لە تەنیشت Colorizeـــەوە،

بەئارەزوی خۆت ڕەنگەکان بێرەو بیانبە تا دەگەی بەوەی کەدڵت پەسەندی دەکات، نموونەکەی من:

# نوێکردنەوەی وێنە کۆنەکان – ڕێگەی 2

لەم وانەیەدا جۆرێکی دیکە یان ڕێگەیەکی دیکە بۆ ڕەنگکردنی وێنە کۆنەکانمان دەگرینە بەر، کە بەڕاستی ڕێگەیەکی سەرکەوتوو و جوانە، چونکە لەم وانەیەدا دەتوانی هەر بەشێکی وێنەکە بەڕەنگێک ڕەنگ بکەی کە بگونجێ لەگەڵیدا بەشێوەیەکی جوان و بێکەموکورتی.

وێنەکی کۆن (ڕەش و سپی) بکەوە، من وێنەی ئەم خاڵو ڕیش سپیەم کردۆتەوە،

ئامرازی دیاریکردنی گۆشەیی هەڵبژێرە لە نێو ئامرازەکانی فۆتۆشۆپ دا،

Polygonal Lasso Tool L

بڕیار بدە کە لە کوێوە دەست پێبکەی، چونکە دەست دانانت لەسەر وێنەکە دەبێتە هەنگاوی دەستپێکردن، کرتەیەک بکە سەر ئەو بەشەی کە دەتەوێ ڕەنگی بکەی و چواردەوری دیاری بکە، من لە سەرەوە دەستم پێکرد،

پاش ئەوەی کە وێنەکەت وەک ئەوەی سەرەوەی لێهات، دەتوانی ئەو بەشەی کەدیاریت کردووە بەڕەنگێکی گونجاو ڕەنگی بکەی.
دەستبنێ بە Ctrl و U دا پێکەوە بۆ کردنەوەی پەنجەرەی ڕەنگەکان، هێمایەکی ڕاست دابنێ لەنێو چوارگۆشەی تەنیشت Colorize ـــەوە، پاشان ڕەنگی بکە،

پاش ڕەنگکردن دەبینین کە بەشە ڕەنگکراوەکە شێوەیەکی جوانی لەخۆی گرتووە،

بەو هەنگاوانەی سەرەوە لە رەنگکردنی سەر تەواو بووین، بۆ بەشەکانی دیکەی وێنەکە دەبێ ئەو هەنگاوانەی سەرەوە ئەنجام بدەینەوەو هەر بەشێک ڕەنگێکی شیاو بەخۆی بۆ هەڵبژێرین، من وێنەکەم بەم شێوەیەی خوارەوە ڕەنگ کردووە،

# وانەی 2

## وێنە دەرهێنان لەفۆتۆشۆپدا

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی بڕینینی وێنەکەک کە لەگەڵ چەند شتێکی دیکە یان وێنەیەکی دیکە تێکەڵاو بێت. بۆ نموونە، ئەم وێنەیەی خوارەوە دوو باڵندەی تێدایەو لەم وانەیەدا ڕوونی دەکەینەوە کە چۆن یەکێک لەو باڵندانە لەوی دیکەیان جیا بکەینەوە.

بۆ ئەی وانەکە بەچاکی جێبەجێ بکەی تکایە هەمان وێنەی سەرەوە لای خۆت بکەوە .

دەڕۆین بۆ لیستەی Filter و لەوێدا کرتە دەکەینە سەر .Extract یان لە سەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت پێکەوە دەست بنێ بە Alt+Ctrl+X.

پەنجەرەیەکی وەک ئەمەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە،

1، بەو پێنووسە ڕەنگکەرە ڕەنگ دەکێشی بە چواردەوری ئەو بەشەی کە دەتەوێ جیای بکەیتەوە، ئەو بەشەی کە جیای هێڵی بە دەوردا دەکێشی، تەنیا بەش دەبێت کە لە کۆتاییدا دەمێنێتەوە .

2، زەڕەبین، بەو زەڕەبینە دەتوانی وێنەکە گەورەتر بکەیت، ئەگەر بەباشی پیکسلەکانیت بۆ نەبینرا .

3، دەست، بەو دەستەش دەتوانی وێنەکە ڕابکێشی بەملاو بەولادا . وێنە

ڕەنگە ئەو هێڵ کێشاندنە هەندێک بێزارت بکات، بەڵام ئەگەر لەگەڵیدا ماندوو نەبیت چاک دەرناچێت. بەردەوام بە لە هێڵ کێشاندنەکەت تا بەتەواوی چواردەوری بەشی ویستراو بۆ دەرهێنان دیاریدەکەیت .

سەیرێکی ئەم وێنەیە بکە پاشان شیکردنەوەکەی بخوێنەوە،

4، بۆ دیاریکردنە ئەو بەشەی کە دیاریت کردووە بەشێوەیەکی تەواوتر و ئامادەکردنی بۆ بڕین .

5، ئەگەر لە شوێنێک دا هەڵەیەکت کردووە دەتوانی بەو ئامرازە

بیسرپیتەوە .
پاش ئەوەی کە لە هێڵ کێشاندنەکە تەواو بوویت، ئامرازی ژمارە 4 ی وێنەی سەرەوە هەڵبژێرەو کرتەیەک بکە نێو بەشە دیاریکراوەکە، لەم کاتەدا دەبێت تەنیا بەشی دیاریکراو شین بکات، ئەگەر وانەبوو مانای وایە هەڵەیەک ڕووی داوە پێش گەیشتن بەم هەنگاوە .
پاشان OK کرتە بکە .
ئێستا دەبینین ئەو بەشەی کە دیاریمان کرد، بڕاوەو کەو بەشەکانی دیکەی وێنەکە جیاکراوەتەوە، بە ئارەزووی خۆت دەتوانی ڕەنگێکی نوێ بۆ پشتەوەی دابنێیت .
وێنەی کۆتایی.

# وانەی 3

# Layerچین چییە؟

ئەم وانەیە تایبەتە بە چینەکان Layers لە فۆتۆشۆپ دا .
چین Layer چییە؟ بۆ باشتر ڕوونکردنەوە ئەم وێنەیەم دروستکردووە وەک نموونەیەک

وێنەی سەرەوە لە دوو چین پێکهاتووە، چینی یەکەم پاشبنەماکەیە ( وێنەی گوڵە زەردەکان )، چینی دووەمیش نووسینەکەیە کە نووسراوە ZKURD.ORG.

شیکردنەوەیەکی دیکە، ئەگەر چاوێک بکەین لە وێنەی خوارەوە زۆرتر بۆمان ڕووندەبێتەوە.

وەک لەوێنەی سەرەوەدا دیاریم کردووە کە ZKURD.ORG ـەکە لە نێو چینێکی جیا لەوەی وێنەکە نووسراوە .

ئایا چۆن بتوانم چینێکی ویستراو دەستکاری بکەم؟

کرتەیەک بکە سەر ئەو چینەی کە دەتەوێت دەستکاری بکەیت، ئەو چینانە هەموویان لە تابلۆی چینەکاندا کۆدەبنەوەو دەردەکەون، بۆ ئەوەی کە دڵنیا بیت چینی ویستراوت هەڵبژاردوە بۆ ئاڵوگۆڕ بەسەردا هێنان دەتوانی سەیری وێنەی خوارەوە بکەیت.

ئەگەر تابلۆی چینەکان نابینیت لە نێو فۆتۆشۆپەکەتدا، دتوانی بە جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوە دەریبخەیت، لە لیستەی Window دا Layersچالاک بکە ، هێمای ڕاست لە تەنیشتیەوە دابنێ

چۆن بتوانم چینێکی نوێ دروست بکەم؟

لێرەدا مەبەست لە چینێکی نوێی خاڵییە، بۆ ئەو مەبەستە دەتوانی لە هەمان تابلۆی چینەکاندا کرتەیەک بکەیتە سەر ئیکۆنی چینی نوێ دروستکردن.

یان دەتوانی لە لیستەی Layer دا New دەستنیشان بکەیت و پاشان Layerکرتە بکەیت، کورتکراوەی ئەو هەنگاوەش Shift+Ctrl+N ـە .

چۆن ناوی چینێک بگۆڕم؟

ئاسانترین ئەوەیە کە دووجار کرتە بکەیتە سەر ناوی چینەکە لە نێو تابلۆی چینەکانداو پاشان ناوێکی دیکەی بۆ بنووسیت .
یان دەتوانی بە دەستی ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت کرتەیەک بکەیتە سەر ئەو چینەی کە دەتەوێ ناوەکەی بگۆڕێت و پاشان Layer Propertiesکرتە بکەیت و لەو پەنجەرەیەی کە دەکرێتەوە لە نێو خانەی بەرامبەر بە Name ناوێکی نوێی بۆ بنووسە.

ئەو چینەی کە بۆ یەکەی جار وەک یەکەم چین لە فۆتۆشۆپدا دەیکەیتەوە ناوەکەی هەمووکات Background ـە، دەتوانی وەک دواترین هەنگاوی ناوبراوی سەرەوە جێبەجێ بکەیت و ناوەکەی بگۆڕیت.

New Layer

Name: چيني يەكەم

Group With Previous Layer

Color: None

Mode: Normal Opacity: 100 %

OK

Cancel

## چۆن بتوانم چینێک بسڕمەوە؟

دەتوانی ئەو چینەی کە دەتەوێ بیسڕیتەوە بکێشیت بۆ سەر ئیکۆنی ( تەنەکەی زبڵ) ـەکە کە لە خوارەوەی تابڵۆی چینەکاندایە.

یان دەتوانی چینەکە شین بکەیت و پاشان لە لیستەی Layer دا کرتە بکەیتە سەر Delete و ئەو کات Layer کرتە بکە چونکە تۆ دەتەوێت چین بسڕیتەوە، پاشان دەبێ داوات لێدەکات کە دەتەوێت بیسڕیتەوە یان نە، تۆش دەبێ خۆت ئەوەیان بزانیت :)

چۆن شوێنی چینەکان بگۆڕم؟

هەندێک جار پێویستمان بەوە دەبێت کە چینێک لە لە چینەکانمان بگوازینەوە بۆ شوێکی دیکە لە سەر ئەو وێنەیەی کە ئیشی لەسەر دەکەین، مەبەستم پاش و پێش خستنی چینەکانە، دەتوانی بە ئیشارەکەری مشکی کۆمپیوتەرەکەت چینەکە بگریت و پاشان بۆ سەرەوە یان خوارەوە بیبەیت

زۆر کەسێک هەیە کە پرسیار دەکەن ئایا ئەو نرخانە بۆچی چاکن، کە لە تابڵۆی چینەکاندا هەن!

ئەو نرخە نرخی چۆنیەتی بینینی چینی دیاریکراوە ( شینکراو )، بۆ نموونە ئەگەر چاوێک بکەین لە وێنەی خوارەوە دەبینین کە نووسینێکی تێدایە نووسراوە ZKURD.ORG بەرەنگی سوور، بەڵام بە باشی نابینرێت یان تۆخ نییە وەک ئەو بەشەکانی دیکەی وێنەکە، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە ئەو نرخەی سەرەوە هەرچی ئەو نرخە خۆر بێت وێنەکە تۆختر دەبینرێت و هەرچی کەمتر بێت کاڵتر دەبینرێت.

زۆر جارێک هەیە کە نووسینێک دەنووسین پاش نووسینەکە دەمانەوێ وێنەکەمان ڕەنگ بکەین یان ئاڵۆگۆڕی بەسەردا بێنین، بەڵام لەوکاتەدا ناتوانین و هێمایەکی وەک ڕێگەپێنەدراو دێتەسەر وێنەکە، بۆ ئەوەی کە لەوە ڕزگارت بێت دەبێت چینی نووسینەکە بگۆڕی بۆ چینێکی ئاسایی و من ئەوە بە چاک نازانم، بەڵام ئەگەر تۆ دەتەوێت دەتوانی بەدەستی ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت کرتەیەک بکەیتە سەر چینی نووسینەکەو پاشان Rasterize Layerکرتە بکەیت .ئەگەریش تۆ وەک منت پێ باشە، من بەچاکتری دەزانم کە چینێکی نوێ بکەینەوە چینی نووسینەکە وەک خۆی بمێنێت .

کاتێک کە سەرقاڵی دروستکردنی وێنەیەکین دەبینین کە هێمای چاوێک لە تەنیشت هەر چینێکەوە هەیە.

ئەگەر ئەو هێمایە لەتەنیشت چینەکەوە هەبێت وادەگەیەنێت کە ئەو چینە ئاشکرایە بۆ بینین و ئەگەر هێمای چاوەکەی لەتەنیشت لابەری ئەوا ئەو چینەش لەسەر وێنەکەت نامێنێت، ئەو تایبەتمەنیە بۆ کاتێک چاکە کە چینێکت هەبێت و نەتەوێت بە هیچ شێوەیەک دەستکاری بکەیت، ئەو کات دەتوانی بەتەواوی بیشاریتەوە. بۆ ئەوەی کە چاوەکە لابەریت دەتوانی کرتەیەکی بکەیتە سەر و نامێنێت .

## چۆن بتوانم دوو چین بکەم بە یەکێک؟

وەک لەوێنەی سەرەوە ڕوونە دەبێت پێش هەموو شتێک یەکێک لە چینەکانمان چالاک بێت و هێمای فرچەکەی لە تەنیشتەوە بێت.
پاشان دەڕۆین بۆ تەنیشت ئەو چینەی کە دەمانەوێ لە گەڵ چینی چالاکدا بیانکەین بە یەکێک، کرتەیەک دەکەینە یەکەمین چوارخانەی لکاو و نزیک لە چینەکەوە، دەبێت ئەو کات هێمایەکی گرێدان دەرکەوێت، وەک لەوێنەی سەرەوە ڕوونکراوەتەوە. پاشان دەتوانی دەستبنێی بەسەر هەردوو دووگمەی Ctrl+E یان لە لیستەی Layerدا Merge Linked کرتە بکەیت .

چۆنیەتی لەڕونووسینەوەی چین :

بۆ ئەوەی لەچینێک ڕونووس بکەیت دەتوانی کرتەیەک بەدەستی

ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت بکەیتە سەری و پاشان Duplicate Layerکرتە بکەیت، یان دەتوانی چینەکە بکێشیت بۆ سەر ئیکۆنی چینی نوێ لە نێو تابلۆی چینەکاندا..

# وانەی 4

## نووسینی 3D لە فۆتۆشۆپ

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی نووسینی وشە بە شێوەی D3، وانەکە زۆر ئاسان و ساکارە، بەڵام ئەنجامەکەی جوانە :).
پەڕەیەکی نوێ بکەوە، من بۆ پانی 500 و بەرزیش 250 پیکسلم هەڵبژاردوە.

ئێستا شتێک بنووسە لە نێو پەڕەکەدا، پێشنیارم وایە کە بە خەتی Impactبینووسیت، وەکوو من.

پاشان لە لیستەی Edit دا Transform دەستنیشان بکەو پاشان Skew کرتە بکە.گۆشەیەکی نووسینەکەت بەلایەکدا بچەرخێنە، گرنگ نییە چ لایەک بێت، بۆ نموونە

پەنجەبنێ بە کلیلی Enter دا بۆ ئەوەی کاریگەریان جێی خۆیان بگرن.

لە لیستەی Layer دا Layer Style و پاشان Bevel and Emboss کرتە بکە،

له بەرامبەر Depth دا 10 .%

Sizeدەبێ 6 PX بێت و Soften دەبێ 5 PX بێت .

بۆ Angle بنووسە 90 و بۆ Altitude بنووسە.60

له هه‌مان پەنجەرەدا له خواره‌وه کرته بکه سه‌ر Stroke و له بەرامبەر Sizeدا نرخه‌کەی بکه به 1، پاشان دەتوانی ڕەنگێک به ئارەزووی خۆت هه‌ڵبژێریت وه‌ک ( سێبەری نووسینەکان، من سووروم هه‌ڵبژاردوه چونکه زۆر بەلامەوه گونجاو بوو له گه‌ڵ ڕەشدا.

OKکرته بکه. ئێستا لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەتدا پەنجەبنێ به کلیلی Alt Gr دا ( تەختەکلیلەکەی من به زمانی سویدیه پەنجەت له سه‌ر ئەو کلیله ڕابگرە له هەمان کاتدا 10 جار یان کەمێک زۆرتر پەنجەبنێ به کلیلی بەرەو سەرەوە .

کلیلیAlt Gr

کلیلی (بەرەو سەرەوە

هیوادارم هەنگاوی کلیلەکان ڕوون بووبێت، بەو شێوە وانەکە کۆتایی پێدێت و ئەنجامی ئیشەکەمان وەک ئەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت،

# وانەی 5

## ڕەنگی وێنەکە بکە بەهی نووسینەکەت

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی تێکەڵاوکردنی ڕەنگی وێنەو نووسینەکەی سەری، بەشێوەیەک کە ڕەنگی نووسینەکە وەک ڕەنگی وێنەکەی لێبێت و بەشێوەیەکی خنجیلانەو جوان دەرکەوێت.

وێنەیەک بکەوە، من ئەمەی خوارەوەم کردۆتەوە:

پاشان نووسینێک بنووسە لە سەری.

لەو تابلۆیەی کە چینەکانی تێدایە، کرتەیەک بە دەستی ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت بکە سەر چینی نووسینەکەو پاشان Blending Options هەڵبژێرە.

پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە، لە دەستی چەپەوە کرتەیەک بکە سەر Bevel and Embossو خاڵەکانی وەک ئەمەی خوارەوە ڕێکبخە.

پاشان OK کرته بکه.
لەو تابلۆیەی کە چینەکانی تێدایە، چینی نووسینەکەت شین بکەو پاشان خاڵی Fill دەستکاری بکە، نرخەکەی لە 100 ـەوە بگۆڕە بۆ 0.

وێنەو نووسینەکە لە کۆتاییدا وەک ئەمەی خوارەوەیان لێدێت.

# وانەی 6

## وێنە کۆن کردن

وێنەیەک بکەوە، بابڵێین ئەمەی خوارەوە بێت

.

ڕەنگی پێشەوە بگۆڕە بۆ سپی و پاشەوەش بۆ ڕەش

لە لیستەی Image بڕۆ سەر Adjustments یان Adjust و پاشان Desaturate هەڵبژێرە.

دەبینی کە وێنەکە کۆن بووە.

# وانەی 7

## دروستکردنی ئاڵایەکی ڕاشەکاوە بەفۆتۆشۆپ

پەڕەیەکی نوێ بکەوە، 500x500 بێ

New

Name: Untitled-5

Image Size: 732K

Preset Sizes: Custom

Width: 500 pixels

Height: 500 pixels

Resolution: 72 pixels/inch

Mode: RGB Color

Contents

White

Background Color

Transparent

OK

Reset

وێنەیەکیش بکەوە، من لێرە ئەم ئاڵایەی کوردستانم کردۆتەوە،

ئاڵاکە کوپی بکەو لە نێو پەڕەکەدا کە کردۆتەوە بیچەسپێنە، لەناوەڕاستی پەڕەکە:(

ڕەنگی پێشەوە بگۆڕە بۆ ڕەش:

ئێستاش CTRL دابگرەو لە هەمان کاتیشدا کرتەیەک بکە سەر ئەو Layer ــەی کە وێنەی ئاڵاکەی لێیە، بۆ دەستنیشان کردنی،

پاشان ئەم ئامزارە دەستنیشان بکەو لەسەرەوەش وەک ئەو شێوەیەی خوارەوە ڕێکیخە:

ئێستاش Layer ێکی نوێ بکەوە، Layerپاشان New وLayer ،

بەو ئامرازەی کە لە هەنگاوی پێشوودا هەڵمانبژارد هەوڵبدە ئاڵاکە وەک ئەمەی من لێبکە:

تێبینی :دەستبردن بە شێوەی پانایی دەبێت نەک بەرزی:

لەژێر Layer ەکانەوە Opacity بگۆڕە بۆ 30:

CTRL وE داگرە پێکەوە بۆ کردنیان بەیەکLayer ، و CTRL و D داگرە ئێستا بۆ دیاری نەکردنی وێنەکە:

دەڕۆین بۆ لیستی Filter و لە وێشەوە Liquify هەڵبژێرە و ئەمپەنجەرەیەت بۆ دێت، وەک لە وێنەکەدا ڕوونە دەستەکە هەڵدەبژێری پێش هەمووشتێک،شتەکانی دیکەش وەک لە وێنەکەدا ڕوونن ڕێکیانخە، ئێستا بە دەستەکە گۆشەکان و نێوەڕاستی ئالاکە بکێشە بۆ دەرەوە هەتا دەگەیت بە شێوەیەک وەک ئەوەی کە لەوێنەکە دایە،

بەو شێوە تەواوت کرد. ئێستا ئالاکەت ڕاشەکاوەیە تەنیا هەندێک وردکاری دەوێت کە خۆت دەتوانی بۆی جێبەجێی بکەی، ئاسان،

شێوەی کۆتایی

# وانەی 8

## چۆنییەتی دروستکردنی Barcode

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی دروستکردنی Barecode.
ئەBarcodeوە کۆدە یان هێمایە کە لەسەر پاکەتی شتەکانی نێو دوکانەکاندا هەیەوە
نرخی ئەو شتەی کە دەیکڕی دەردەخات .
پەڕەیەکی نوێ بکەوە، 200 x80و لەگەڵ پاشبنەمای سپی و.RGB

لەلیستەی Filter دا کرتە بکەسەر Noise و پاشانAdd Noise ، وەک ئەمەی خوارەوە ڕێکیبخە
Amountبنووسە 400
بۆ Distribution دەری Gaussian بێتێ .
Monochromaticـیش چالاک بکە

ئەم هەنگاوەش هەر لەلیستەی Filter دایەو ئەمجارەیان کرتە بکە سەر Blur و پاشان

Motion Blurهەڵبژێرە

بۆ Angle بنووسە 90

Distance 500پیکسل بێت

له تابلۆی چینەکاندا کرتە بکە سەر ئیکۆنی چینی نوێو چینێکی نوێ بکەوە

بە ئامرازی دیرایکردنی لاکێشەیی لاکێشەیەک بکێشە لە نێوەڕاستی وێنەکەدا و لە نێو چینیە نوێکەدا

ئێستا تەنیا ئەوە ماوە کە هێما ژمارەییەکان بنووسیتە سەری

# وانەی 9

## ڕووناك كردنەوەی وێنە

ئەم وانەیە بریتییە لە كاریگەریەكی زۆر جوان، زۆر كات دەبێت كە پێویستمان بە كاریگەریەكی لەم بابەتە دەوێت بۆ ئەوەی لەسەر وێنەكانمان جێبەجێی بكەین،
كاریگەریەكە بریتییە لە چۆنیەتی ڕووناككردنەوەی وێنە بە چەند هەنگاوێكی كورت و ئاسان .وێنەیەک بکەوە بۆ ئەوەی كاریگەریەكەی لەسەر جێبەجێ بكەیت، من ئەمەی خوارەوەم كردۆتەوە، ئەگەر وێنەت لەبەر دەستدا نییە دەتوانی هەر ئەوەی من لای خۆت پاشەكەوت بكەیت و پاشان بیكەیتەوە

ئەو وێنەیەی سەرەوە لە سایتی Kurdistan News وەرگیراوە .

لە تابلۆی چینەكاندا چینی وێنەكە شین بكەو پاشان ڕایكێشە بۆ سەر هێمای لەرونووسینەوە، یان بەلای ڕاستی مشكی كۆمپیوتەرەكەت كرتەیەكی بكە سەر و پاشان Duplicate Layerكرتە بكە.

له لیستەی Filter دا Blur دەستنیشان بکەو پاشان Gaussian Blur کرتە بکە،
نرخی Radius دەبێت لە نێوان 1 و 2 دا بێت.

پاشان OK کرتە بکە .
لە تابلۆی چینەکاندا ئەمجارە Screen هەڵدەبژێرین.

بەو شێوە دەبینین کە وێنەکە ڕەنگەکەی لەوەی ئەسڵی خۆی ڕووناکتر بووەتەوە .
پێش دانانی کاریگەر

پاش

# وانەی 10

# شێوەکانی ناو فۆتۆشۆپ

لەم وانەیەدا شیدەکەمەوە کە چۆن لە شێوەکانی نێو فۆتۆشۆپ سوود وەربگرین و لەنێو وێنەو شتی دیکەدا بەکاریان ببەین .

بۆ ئەوەی ئەو شێوانە دەربخەین و بیانبینین لە سەر تووڵی ئامرازەکانی فۆتۆشۆپ، دەبێ کرتە بکەینە سەرCustom Shape Tool ، لە نێو تابلۆی ئامرازەکانی فۆتۆشۆپدا،

پاشان لەسەرەوە لەسەر تووڵی ئامرازەکان شێوەکانمان بۆ دەردەکەوێت،

بەڵام دەتوانین ئەو شێوانە زۆر بکەین و شێوەی دیکەی تێ بێنین،

بۆ ئەوەی زۆریان بکەین کرتە بکە سەر ئەو هێمایەی کە بازنەیەکی سووری بەدەوردا کێشراوە لەنێو وێنەی خوارەوە،

پاشان لەو لیستەیەی کە بۆت دێتە پێشەوە، کرتە بکە سەرLoad Shapes ، و پاشان دەچێتە ئەو شوێنەی کە شێوەکانی تێدایەو لەوێدا All دیاریبکەو پاشان Load کرتە بکە،

ئێستا گەر جارێکی دیکە سەیری شێوەکان بکەینەوە دەبینین کە زۆر بوون و شێوەی جۆراوجۆری تێهاتووە .

چۆنیەتی بەکاربردنی ئەو شێوانە: لێرەدا شێوەیەک بۆ بەکاربردنی ئەو شێوانە شیدەکەمەوە، بۆ نموونە پەڕەیەکی نوێ بکەوە، بەئارەزووی خۆت پانی و بەرزی بۆ هەڵبژێرە، شێوەیەک لە
شێوەکان هەڵبژێرە، من ئەم شێوەیەم هەڵبژاردووە کە بریتییە لەگەڵایەک،

پاشان لە نێو پەڕەکەدا دەستت بەلایەک دا ببە، تا شێوەی گەڵاکە دەکێشیت. پاشان
ئێستا چەند هەنگاوێک جێبەجێدەکەین بۆ جوانکردنی شێوەکە، لە لیستەی Layer دا
Layer Styleدەستنیشان بکەو پاشان Bevel and Emboss کرتە بکە، وەک
ئەمەی خوارەوە ڕێکبخە

لەهەمان پەنجەرەدا کرتە بکە سەر Color Overlay و ڕەنگەکەی بگۆڕە بە ڕەنگی )
پرتەقاڵی تاریک( ئەمە کۆدەکەیەتی E39E0B پاشان OK کرتە بکە.

لە لیستەی Filter دا Blur و پاشان Gaussian Blur کرتە بکە، وەک ئەمەی
خوارەوە ڕێکبخە

جارێکی دیکەلە لیستەی Filter دا و بەڵام ئەمجارەیان Sharpen و پاشان Unsharp Maskکرتە دەکەین، وەک خوارەوە ڕێکیبخە.

پاشان دەبینین لەو شێوەیەی فۆتۆشۆپ گەڵایەکی ڕەنگدار و جوانمان دروستکرد، ئەنجامەکەی لای من بەم شێوەیە بوو:

# وانەی 11

## دروستکردنی پەڕیەیەکی سووتاو بەفۆتۆشۆپ

پەڕەیەکی نوێ بکەوە.

کەرەستەی دیاریکردنی گۆشەیی هەڵبژێرە

شێوەیەکی وەک ئەمەی خوارەوە یان هاوشێوەی بکێشە،

لەلیستەی Image لە Mode و پاشان RGB Color دیاری بکە.

1:ئامرازی ڕەنگکردنی گشتی هەڵبژێرەو وەک لەخوارەوە ڕوونە
2:ڕەنگەکە ئەگەر زەرد بێت لەوانی دیکە چاکترە، وەک ئەوەی خوارەوە

ئامرازی سووتاندن هەڵبژێرە:

بۆ زلی ئامرازەکە، وەک وێنەی خوارەوە هەڵبژێرە؛

بەچرکە چرکە کردن لە سەر کەناری وێنەکە، ڕەنگەکەی کەمێک لەوەی ناوەڕاستیەوە تاریکتر بکە،

بەو شێوە كۆتایی دێت .
خۆشت دەتوانی نووسین و شتی دیكەی بخەیتە سەر

# وانەی 12

## گۆڕینی ڕەنگی چاو

وانەی ئەمجارەمان، وانەیەکی کورت و ئاسانە!
گۆڕینی ڕەنگی چاو لە فۆتۆشۆپ بەچەند هەنگاوێکی کورت.
وێنەیەکی چاو بکەوە، دەتوانی ئەم وێنەیەی خوارەوە لای خۆت هەڵگری و پاشان بیکەیتەوە،

پاشان وەک لەوێنەکە ڕونکراوەتەوە ئامرازی بازنەکێشان هەڵبژێرەو ڕەنگی پێشەوەش بگۆڕە بەوڕەنگەی کە ئەتەوێ چاوەکەی پێ ڕەنگ بکەی، من لێرە سەوزم هەڵبژاردوە

پاشان بازنەیەک بکێشە ڕوی گلێنەی چاوەکەدا.

ئەگەریش بازنەکەت بە ڕێکوپێکی بۆ نەکێشێردرا، دەتوانی لەلیستەی Edit ـەوە Free Transformهەڵبژێری و پاشان بەئارەزوی خۆت بازنەکە چاک بکەیت. کە بازنەکەت کێشا بەبێ کەموکۆڕی دەتوانی ئەم هەنگاوەش کە هەنگاوی کۆتایی هێنانە بە بابەتەکە جێبەجێ بکەی. وەک لە وێنەی خوارەوە ڕوونە Color ! هەڵبژێرە.

بەو شێوە دەبینی کە ڕەنگی چاوەکە گۆڕاوە بۆ ئەو ڕەنگەی کە بۆت دیاریکرد.

## نموونەی تر

**لە پێشدا**

**دواتر**

# وانەی 13

# چۆنییەتی هێڵ بڕین لەفۆتۆشۆپدا

لەم وانەیەدا چۆنیەتی دروستکردنی هێڵێکی جوان لە گەڵ دانانی کاریگەری بڕین لەسەری شیدەکەمەوە. ئەم هێڵە دەتوانرێ لە ماڵپەڕدا خاوەن ماڵپەڕەکان لە بەشی خوارەوەی ماڵپەڕەکانیان بەکاری ببەن .

بۆ دەستپێکردن، پەڕەیەکی نوێ بکەوە بەم تایبەتمەندیانەی خوارەوە:

چینێکی نوێ دروست بکە، Layer>New>Layerو پاشان ئامرازی دیاریکردنی چوارگۆشەیی هەڵبژێرە

دڵنیابە کە چینە دروستکراوەکە دەستنیشانکراوە

ئێستا لاکێشەیەک بکێشە وەک وێنەی خوارەوە،

ئامرازی Paint Bucket Tool هەڵبژێرە،

پاشان ڕەنگێک بۆ ڕەنگی پێشەوە هەڵبژێرە، من ڕەشم هەڵبژاردووە، دەبێ لاکێشەکەش دیاریکرابێت .

کرتەیەک بکەسەر لاکێشەکە و ڕووی پڕبکە لەڕەنگ، پاشان بڕۆ بۆ لیستەی Layer » Layer Styleو لەوێدا کرتە بکە سەرGaradient Overlay ، دەبێ پەنجەرەیەکی لەم شێوەیەت بۆ بکرێتەوە

لەبۆ Gradient ئەو شێوەیە هەڵبژێرە کە لەوێنەکە بازنەیەکی سووری بەدەوردا کێشراوە، پاشان کرتەیەکیش بکە سەر شێوەکە پاش هەڵبژاردنی، مەبەستم شێوەی ژمارە 1 ـە . پەنجەرەیەکی لەم شێوەیە دەکرێتەوە،

وەک لەوێنەی سەرەوە ڕوونە، دووجار کرتە بکەسەر ئەو ئامرازەی Color Stop نێو بازنە سوورەکە 2)، پاشان پەنجەرەیەکەی تایبەت بە ڕەنگ هەڵبژاردنت بۆ دەکرێتەوە،

ئەم ڕەنگەی بۆ هەڵبژێرە FFBA00 و پاشان OK بکە، ئەم جارەیان کرتە بکەسەر Color Stopـی ژمارە 3 و ئەم ڕەنگەی بۆ هەڵبژێرە، FCFF00پاشان OK کرتە بکە .

لەنێو بەشی ستایلەکاندا کرتە بکە سەر Bevel and Emboss و وەک خوارەوە ڕێکبیخە،

ئەمجارەیان Storke و پاشان وەک شێوەی خوارەوە ڕێکیبخە،

OKکرتە بکەو لەپەنجەرەی تایبەت بە ستایلەکان و بڕۆ دەرەوە .
بەو شێوە دەبێ هێڵێکی جوانت دروستکردبێت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە کاریگەری
بڕینی لەسەر دابنێین و شێوەیەکی جوانی پێ ببەخشی، بۆیە دەبێ ئامرازی
Polygonal Lasso Tollهەڵبژێری،

ئێستا بەو ئامرازە، لاکێشەیەکی 45 (دەرەجەیی بکێشە بەسەر شوێنێکی لاکێشە
ئەسڵیەکەدا) ، لەوێنەی خوارەوە ورد بەوە

پاش کێشانی لاکێشەکە، پەنجە بنێ بە کلیلی Delete لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت
بۆ بڕینی ئەو بەشەی کە لاکێشە بچووکەکەی لەسەر کێشراوە، پاش بڕین دەتوانی بە
کلیلەکانی (ڕاست، چەپ، بۆسەرەوە، بۆخوارەوە) ی سەر تەختەکلیلەکەت ببەیتە سەر
بەشەکانی دیکەی هێڵەکە و پاشان بەهەمان شێوە بیانبڕی .
شێوەی کۆتایی لای من بەم شێوەیە بوو، هیوادارم لای تۆش جوان دەرچووبێت.



نموونەیەکی دیکە

# وانەی 14

# ڕەنگدانەوە

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی دانانی کاریگەری ڕەنگدانەوە لەسەر وێنەو نووسین، وەک ئەم نموونەیە

پەڕەیەکی نوێ بکەوە، پێم باشە 400 x400بکەیتەوە، بۆ دابینکردنی شوێنی ئیشەکەت بەباشی.

ڕووی پەڕە نوێکە بە ڕەنگی ڕەش پڕبکەوە .

دپەنجە بنێ بە پیتی T بۆ دەرخستنی ئامرازی نووسین، پاشان خەتێک هەڵبژێرە کە کەمێک قەڵەو بێت، بۆ نموونە من خەتی Impact ـم هەڵبژاردوە، پاشان نووسینەکەت بنووسە من نووسیمZKURD.ORG ،

چینی نووسینەکە کۆپی بکە، Layerپاشان Duplicate Layer و پاشانOK ، لە
لیستەی Edit دا Transform هەڵبژێرەو پاشان Rotate 180 هەڵبژێرە

جارێکی دیکە بڕۆوە بۆ لیستەی Edit و پاشان Transform بەڵام ئەمجارەیان Flip
Horizontalکرتە بکە، پاشان دەبینین کە نووسینەکەمان وەک ئەمەی خوارەوەی
لێدێت،

پەنجە بنێ بە پیتی V دا و پاشان پەنجە بنێ بە Shift دا و بە دووگمەی بۆخوارەوە نووسینەکەت بێنە خوارەوە، تا بەم شێوە ڕێکیدەخەیت.

لە تابڵۆی چینەکاندا کرتە دەکەینە سەر ئیکۆنی Add Layer Mask و شێوەی چینەکە دەگۆڕێت،

لە سەر تابڵۆی ئامرازەکاندا Gradient Tool هەڵدەبژێرین،

لەسەر تووڵەکەش لەسەرەوە دەبێت بەم شێوە ڕێکیبخەیت،

ئێستا هەنگاوی گرنگی ئەم ئیشە جێبەجێ دەکەین، پاش ئەوەی کە شتەکانی سەرەوەت هەموو وەک خۆی جێبەجێ کرد، پەنجە بنێ سەر دووگمەی Shift لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت و پاشان بە مشکی کۆمپیوتەرەکەت دەستت لەسەر سنووری نێوان هەردوو چینەکە (نووسینەکان) دابگرە پاشان بۆ خوارەوە دەست بکێشە، سەیری وێنەی خوارەوە بکە

جارێکی دیکە دەڕۆینەوە بۆ نێو تابلۆی چینەکان و لەوێدا نرخی Fill کەم دەکەینەوە بۆ 35 یان 30 ئەوەی کە خۆت پێت باشە.

لەکۆتاییدا بەم شێوە دەبێت.

ئەگەر ئەو کاریگەریە لەنێو پەڕەیەکدا دابنرێت کە ڕەنگی پاشبنەمای وەک خۆی بێت زۆر جوانتر دەبێت لەوەی کە بەڕەنگێکی دیکە بێت .نموونە .
دەتوانی ئێرەش کرتە بکەی بۆ داگرتنی پەڕگەی ئەم وانەیە بە فۆرماتی .PSD
دەتوانی هەمان هەنگاوانەی سەرەوە لەسەر وێنەش جێبەجێ بکەیت و هەمان کاریگەری دەردەکەوێت، بەڵام بەشێوەی دیکەش دەکرێت.
کاریگەریەکە لەسەر وێنە.

# وانەی 15

# دروستکردنی کاریگەرییەکی جوان بەفۆتۆشۆپ

لەم وانەیەدا چۆنیەتیی فێربوونی دانانی گاریگەرییەکی جوان لەسەر وێنەکان فێر دەبیت، کاریگەرییەکە کاتێ بەکار دەبرێت گەر بتەوێ بەشێ لە وێنەیەک لە باقییەکەی تری ڕوونتر بێت و باشتر دەرکەوێت .

لە پێشدا پێویستت بە وێنەیەکە کاریگەرییەکەی لەسەر جێبەجێ بکەین، بۆ نموونە ئەم وێنەیەی خوارەوە

ئامرازی دیاریکردنی بازنەیی هەڵبژێرە !

بەشێک لە وێنەکە دیاری بکە کە دەتەوێ لە چاوەی بەشەکانی تر زۆرتر ڕوونی بکەیتەوە.
پاشان پەنجە بنێ بە دووگمەکانیCtrl+Shift+i ،
پاشان دەبێ بەشە دیاریکراوەکەی خۆت و چواردەوری وێنەکە دیاری کرابێت، وەک شێوەی خوارەوە :

بڕۆ بۆ لیستەی Filter و پاشان Blur و لەوێدا Redial Blur کرتە بکە،

Amount = 60

Blur Method : Zoom

Quality : Good

پاشان .OK

دەبینی کە کاریگەرییەکە شێوەیەکی جوانتر دەبەخشێ بە وێنەکە.

هەندێک جار دەبێ ئامرازی دیاریکردنی جۆراوجۆر بەکار ببەی بۆ دیاریکردنی بەشەکانی وێنە، بۆ نموونە لەم وێنەیەی خوارەوە ئامرازی دیاریکردنی) گۆشەیی)م بەکار

بردووه.

# وانەی 16

## تێکەڵکردنی رەنگی دوو وێنە

ئەم بابەتە بریتییە لە چۆنیەتی تێکەڵاوکردنی ڕەنگی دوو وێنە پێکەوە، بە شێوەیەکی جوان .

پێش هەموو شتێک دەبێ دوو وێنە بکەینەوە لە فۆتۆشۆپ دا بۆ ئەوەی تێکەڵاوی یەکتریان بکەین. من ئەم دوانەی خوارەوەم کردۆتەوە

پاشان یەکێک لەو وێنەنا دێنین بۆ ناوی ئەوەکەی دیکەیان، پێم باشە کە ئەوەیان بچووکە بیهێنین، وەک ئەمەی خوارەوە.

ئێستاش لە تابلۆی ئامرازەکاندا، ئامرازی دیاریکردنی چوارگۆشەیی هەڵدەبژێرین، و پاشان نرخەکەی لەسەرەوە، لە 0 ـەوە دەیگۆڕین بە 30، ئەگەر ویستت وێنەکان زۆرتر تێکەڵاو بکەی دەتوانی ئەو نرخەش زۆرتر بکەیت،

ئێستا چوارگۆشەیەک دەکێشینە سەر سنووری هەردوو وێنەکە، لەو شوێنەی کە بەیەک دەگەن، وەک ئەمەی خوارەوە.

ئێستاش دواترین هەنگاو جێبەجێ دەکەین، لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت پەنجەیەک بنێ بە کلیلی Delete و پاش ئەو هەنگاوە دەبینی کە سنووری نێوان وێنەکان تێکەڵاو بوون .

وێنەی کۆتایی.

# وانەی 17

# گۆڕینی شێوە ڕاستەکان لەفۆتۆشۆپدا

لێرەدا چۆنیەتی گۆڕینی ڕاستی دەموچاو شیدەکەمەوە:

وێنەیەک بکەوە ) پێشنیارم وایە کە فۆرماتی وێنەکە (JPEG (JPG, JPEG, JPE بێت، بۆ ئاسانکردنی ئیشەکەت.

من ئەم وێنەیەم کردۆتەوە

بە ئامرازی دیاریکردنی لاکێشەیی چواردەوری ئەو بەشە دیاری بکە کە دەتەوێ دەستکاری بکەی:

ئێستا دەڕۆین بۆ لیستەی Filter و لەوێشدا Liquify هەڵدەبژێرین:

پاشان ئەم پەنجەرەیەمان بۆ دەکرێتەوە.
وەک لەوێنەکەدا ڕونکراوەتەوە، بە ئامرازی دەستەکە دەتوانی وێنەکە بکێشی بەملاو بەولادا. شتەکانی دیکەش وەک ئەوەی سەر وێنەکە ڕێکخە، و کاتێک تەواوت کرد OK کرتە بکە.

ئێستا وێنەکە چاولێبکە، دەبینی کە گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا هاتووە.

# وانەی 18

## ئیفێکتی ماتریکس ( فۆتۆشۆپ )

پەڕەیەکی نوێ بکەوە،

بڕۆ بۆ لیستەی Filter و Texture دەستنیشان بکەو لەو لیستەیەی کە بۆت دێتە دەرەوە ...Grain هەڵبژێرە

ئێستەش بۆ Intensity بنووسە 100، هەروەها بۆ Contrast یش، Verticalیش هەڵبژێرە بۆGrain Type

ئەمجارەش دەبێ بڕۆینەوە بۆ لیستەی Filter و Artistic دیاریبکەین و پاشانیش Neon Glowهەڵبژێرین:.

لەتەنیشت Glow Size ـــوە ژمارە 5 و لە تەنیشت Glow Brightness یشەوە 20 بنووسە و Glow Color بگۆڕە بەڕەنگی سەوز

بۆ ئەم هەنگاوەش دەبێ دیسان بگەڕێینەوە بۆ لیستەی Filter و ئەمجارەیان Stylize هەڵدەبژێرین و Glowing Edges کرتە دەکەین:

بۆ Edge Width بنووسە 1، Edge Brightnessبنووسە 7، Smoothness یش 1:

هەنگاوی کۆتایی هێنان بەوانەکە لە لیستەی Image ـــەوە دەبێت، لەو لیستەدا Adjustmentsدەستنیشان دەکەین و پاشانیش (Ctrl+U)Hue/Saturation کرتە دەکەین:

Image
Mode
Adjustments
Duplicate...
Apply Image...
Calculations...
Image Size...
Canvas Size...
Rotate Canvas
Crop
Trim...
Reveal All
Histogram...
Trap...

Levels... Ctrl+L
Auto Levels Shft+Ctrl+L
Auto Contrast Alt+Shft+Ctrl+L
Auto Color Shft+Ctrl+B
Curves... Ctrl+M
Color Balance... Ctrl+B
Brightness/Contrast...
Hue/Saturation... Ctrl+U
Desaturate Shft+Ctrl+U
Replace Color...
Selective Color...
Channel Mixer...
Gradient Map...
Invert Ctrl+I
Equalize
Threshold...
Posterize...
Variations...

ئیشارەی ڕاست دابنێ لەنێو چوارگۆشەی تەنیشت colorize و Hue بگۆڕە بۆ 140 و Saturation یش بگۆڕە بۆ 100:.

له كۆتایی دا بەم شێوەیە دەبێت:

# وانەی 19

## چۆنییەتی دانانی فیلتەری نوێ بۆ بەرنامەی فۆتۆشۆپ

ئەم وانەیە لەکاتی دانانی فیلتەری Eye Candy 4000دروستکراوە

## *Read Me*

Important information about known conflicts, new features and installation instructions is included. Please read these release notes for Eye Candy 4000 carefully.

Thank you for buying Alien Skin Software's Eye Candy 4000.

In this Readme file:

1. Host and system requ
2. Installation instructior
3. Latest information abo
4. Alien Skin contact inf

************************************

1. Host and System Re

Eye Candy is a plug-in s ... s; it must be used with one ...

Host Requirements for Windows:

کلیکی ئێرە بکە

Click "Next" to continue.
Click "Cancel" to abort the installation.

< Back | Next > | Cancel

@ ئێستا بەرنامەی فۆتۆشۆپ بكەرەوەو سەیری لیستیFilter بكە

## ستايلٚ دروستكردن لەفۆتۆشۆپ

هەموو بەكارهێنەرانى فۆتۆشۆپ دەزانن كە فۆتۆشۆپ خۆى چەندين ستايلى ئامادە و جواروجۆرى هەيە. بەڵام ئەوە ماناى ئەوە نييە كە خۆمان نەتوانين ستايلى نوێى بخەينەسەر، بەڵكو دەتوانين و شتێكى زۆر ئاسانە .

پرۆگرامى Adobe Photoshop بكەوە، پەڕەيەكى نوێ بكەوە.

نووسينێك بنووسە گرينگ نييە بە چ ڕەنگێك بێت .

پاشان لە ليستەى Layer لە Layer Style دەستنيشان بكە و Drope Shadowكرتە بكە. پاشان پەنجەرەى تايبەت بە Drope Shadow دەكرێتەوە و وەك شێوەى خوارەوە ڕێكى بخە.

لەهەمان پەنجەرەدا كرتە بكە سەرGradient Overlay .

وەک لە وێنەی سەرەوە روونە کرتە بکەسەر رەنگەکانی تەنیشت Gradient، پاشان دەبێ پەنجەرەیەکی رەنگ هەڵبژاردن و رێکخستن بکرێتەوە،

دەتوانی ڕەنگە ڕەشە بگۆڕی بە سەوز، لەڕێگەی کرتە کردنەسەر ئەو ئامرازەی Color Stop و پاشان ئەم کۆدەی تێدا بنووسی بۆ ڕەنگی سەوز FF0072، هەمان هەنگاو دووبارە بکەوە بۆ ڕەنگە سپییەکەو ئەم کۆدەی تێدا بنووسە B10066، پاشان OK کرتە بکە لەسەرەوە .

جارێکی دیکە دەگەڕێیتەوە بۆ پەنجەرەی Blending Options و لەوێدا کرتە بکەسەر Bevel and Emboss و وەک وێنەی خوارەوە ڕێکی بخە،

پاشان Outer Glow کرتە بکە، وەک شێوەی خوارەوە ڕێکی بخە،

دەتوانی گۆڕانکاری و هەڵبژاردنی دیکەی زۆر جێبەجێ بکەی، بەڵام مەبەستی وانەکە ئەوەبوو کە تەنیا بیرۆکەی ستایڵ دروستکردن شیبکەمەوە، بەو شێوە ستایڵەکە دروستکردووەو ئامادەیە، ئێستا لە پەنجەرەی Blending Optionsدا کرتە بکە سەر Style ، بۆ پاشەکەوتکردنی ئەو شێوەیەی کە دروستت کرد وەک ستایڵێک،

لەنێو پەنجەرەی Style دا کرتە بکە سەر New Style و پاشان ناوێک هەڵبژێرە بۆ ستایڵەکەت و OK کرتە بکە.

بەو شێوە خۆت بە ئارەزووی خۆت و پێویستی خۆت ستایڵێکت دروستکرد کە دەتوانی هەر کاتێک ویستت بەکاری بەی بەبێ ئەوەی کە هەمووجارێک هەنگاوەکانی دووبارە بکەیتەوە.

Styles
Blending Options: Default
Drop Shadow
Inner Shadow
Outer Glow
Inner Glow
Bevel and Emboss
Contour
Texture
Satin
Color Overlay
Gradient Overlay
Pattern Overlay
Stroke

Styles

دەبینی کەستایڵەکەت
لێرەیە

OK
Cancel
New Style...
Preview

نموونەیەک لە کاریگەری ستایڵەکە

# کاریگەرییەرییەکی جوان بۆ نووسین بەفۆتۆشۆپ

لەم وانەیەدا چۆنیەتی دانانی کاریگەریەکی جوان و ئاسان بۆ سەر نووسین شیدەکەمەوە، هیوادارم سوودی هەبێت .
فۆتۆشۆپ بکەوە، پەڕەیەکی نوێ بکەوە، پانی 500 و بەرزی 300. لەگەڵ پاشبنەمای سپی .
نووسینێک بنووسە، من خەتی Arial Black ـم هەڵبژاردووە، لەگەڵ قەبارەی 100 و نووسیومە .ZKURD پاشان لە ستایلەکانی نێو فۆتۆشۆپ کاریگەری ستایلێکی لەسەر دانێ .
بۆ نموونە من ئەم شیوە کاریگەریەم داناوە،

جارێکی دیکە، هەمان نووسینی کە پێشتر نووسیت، بینووسەوە،
.(ZKURD)و بەرێکووپێکی لەسەر نووسینەکەی پێشوو دایبنێ .

ZKURD

وەک هەنگاوی پێشوو بۆ نووسینی یەکەم، کاریگەری ستایلێکی دیکە لەسەر ئەم نووسینە نوێیە دابنێ، بۆ نموونە من ئەمەم داناوە .

ئامرازی سڕینەوە هەڵبژێرە، کرتەیەک بکە سەر نووسینەکە، ئەم پەیامەت بۆ دێتە پێشێ، کرتە بکە سەر.OK

پاشان شێوەیەک لە شێوەکانی سڕێرەر هەڵبژێرە بۆ بەکارهێنانی لە سڕینەوەی نووسینی دووەم .

ئێستا بە ئامرازی سڕینەوە کرتە بکە سەر نووسینەکە، چەند جارێک، لەهەمان کاتدا شێوەی سڕێرەر بگۆڕە بۆ سڕینەوە لە نووسینی دووەم بە شێوەی جۆراوجۆر .

نابێ نووسینی یەکەم هیچی لێبسڕێتەوە. ئەوەی کە من دروستم کرد، ئەمەیە .

# دروستكردنی ئەلبوومێكی وێنە بۆماڵپەڕی سایتەكەت

لەلیستەی File پاشان Automate و لەو لیستە بچوكەش كە بۆت دێتە دەرەوە Web Photo Gallery...هەڵبژێرە!

ئەم وێنەیەی خوارەوەت بۆ دێتە پێشێ:

، 6:بۆ دیاریکردنی شێوەی ئەڵبومەکە.

2: دیاریکردنی جۆری یان فۆرماتی پاشەکەوت کردنی ئەڵبومەکە بۆ نموونە htm یان html .

پێش ئەوەی باسی ئیشی خاڵی سێیەم و چوارەم بکەم، پێم باشە کە دوو بوخچە (فۆڵدەر)ی نوێ دروست بکەیت، لە یەکێک لەو بوخچانە ئەو وێنانە دابنێ کە ئەتەوێ بیانکەی بە ئەڵبوم ، ئەوەکەی دیکەش دەبێتە شوێنی ئەڵبومەکە لەپاش پاشەکەوت کردنی.

3:دیاریکردنی ئەو بوخچەیەی کە وێنەکانی تێدایەو ئەتەوێ بیانکەی بەئەڵبوم. هەموو وێنەکانی سەپۆرت کراو دەخاتە نێو ئەڵبومەکەوە. ئەگەر وێنەیەکی تیایەو ناتەوێ بیخەیتە

ئەڵبومەکەوە، لەوێ لایبەرە! .
:4دیاریکردنی ئەو بوخچەیەی کە پەڕگە (فایل) ـــەکانی ئەڵبومەکەی تێبچێت، پاش پاشەکەوت کردن.
:5نوسینی هەندێک زانیاری لەسەر خاوەن ئەڵبومەکەو هەڵبژاردنی جۆری پیتەکان ( فۆنت.(
:6لەسەرەوەش نوسراوە، پێشبینینی شێوەی ئەڵبومەکە.
:7تەواوکردنی ئیشەکە.
خاوەن ماڵپەڕیش لەهەموو کەسێکی دیکە چاکتر دەزانێ کە چۆن ئەڵبومەکە دابنێ لە نێو ماڵپەڕەکەی خۆی.

# لینك دروستكردن بەفۆتۆشۆپ و ئیمەیج رێدی

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی دروستکردنی بەستەر لەگەڵ هەردوو پرۆگرامی Adobe Photoshop و ImageReady. نیوەیەک لەم بابەتە لەفۆتۆشۆپ دا دروست دەکرێت ئەو نیوەکەی دیکەی لە ئیمەیجرێیدیدا .

فۆتۆشۆپ جگە لەوەی کە باشترین پرۆگرامی سەردەمە بۆ دەستکاریکردن و دروستکردنی وێنە، ئیشی ماڵپەڕ دروستکردنیش جێبەجێ دەکات بەشێوەیەکی نایاب و زۆر سەرکەوتووانە، ئەگەر کات تەرخان بکەیت بۆ فۆتۆشۆپ و ئیمەیجرێیدی بۆ ماڵپەڕ دروستکردن، دەتوانی ماڵپەڕێکی زۆر سەرکەوتوو و خاوێن دروست بکەیت، بەڵام بە ڕاستی کاتی دەوێت .

من لەم بابەتەدا تەنیا تیشک دەخەمە سەر گۆشەیەکی بچووکی ئەو بوارەی فۆتۆشۆپ و ئیمەیجرێیدی، ئەویش بەستەر دانانە .

دەبێ لە پێشدا لە فۆتۆشۆپ دا ئەو دووگمە یان وێنەیەی کە دەمانەوێ بەستەری بۆ دابنێین، دروستی بکەیت، و پاشان بیگوازیتەوە بۆ ئیمەیجرێیدی بۆ هەندێک جوانکردنی، من بۆ خۆم دوو دووگمەم دروستکردوە لە فۆتۆشۆپ دا و دەتوانی تۆش ئەو پەڕگەیە لای خۆت دابگریت و لەسەر ئەوە ئیشەکان جێبەجێ بکەیت

داگرتنی دووگمە .

ئەگەر پێت خۆشە کەخۆت دووگمە دروستبکەیت، دەتوانی ئێرە کرتە بکەیت و بابەتێک بخوێنیتەوە لە سەر دووگمە دروستکردن بۆ ماڵپەڕ .

پاش ئەوەی کە پەڕگەکەت داگرت، لە فۆتۆشۆپ دا بیکەوە، بە هیچ شێوەیەک گۆڕانکاری تێدا جێبەجێ مەکەو ڕاستەوخۆ بیگوازەوە بۆ ئیمەیجرێیدی، کرتە بکە سەر دووگمەی گواستنەوە بۆImageReady

پاش ئەوەی کە ImageReady کرایەوە، کرتەیەک بکە سەر چینی شێوەی دووگمەی یەکەم، و شینی بکە

ئێستا ئامرازی Slice هەڵبژێرە، بۆ دیاریکردنی شوێنێک کە بتوانی بەستەری لەسەر دابنێیت،

وەک لەسەرەوە نووسیومە کە چینی شێوەی دووگمەی یەکەم دیاریدەکەین، ئێستا بەو ئامرازەی Slice چوارچێوە بکێشە بە چوارلاکانی شێوەی دووگمەی یەکەم ( Zkurd.org)

پاش ئەو هەنگاوە، دووجار کرتە بکەسەر ئەو شوێنەی کە سنوورت کێشا بەچواردەوریدا

پەنجەرەکی وەک ئەمەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە

لە خانەی URL دا ناوونیشانی ئەو شوێنە ئینتەرنێتیە بنووسە کە کاتێک کەسێک کرتەی کردە سەر Zkurd.Org بچێتە سەری .
دەتوانی لە خانەی Target دا شوێنێک هەلبژێریت کە پەڕەکەی تێدا بکرێتەوە، بۆنموونە :پەنجەرەکی نوێ، هەمان چوارچێوە، ...
لە تابلۆکانی ImageReady دا لە تابلۆی سێیەمدا کرتە بکە سەر Roolover و پاشان بەدەستی ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت کرتەیەک بکە سەر ئەو چینەی کە بەستەری بۆ کراوە Add Rollover State کرتە بکە

له تابلۆی چینەکاندا کرتە بکە سەر ئیکۆنی Layer Style و Color Overlay کرتە بکە

پاشان له تابلۆی سەرەوەتردا شێوەی تابلۆکەت بۆ دەگۆڕدرێت و چەند هەڵبژاردنێکت بۆ دێنە پێشەوە، له خانەی ڕەنگەکاندا ڕەنگێک هەڵبژێرە، ئەم ڕەنگە کاتێک دەردەکەوێت کە نیشانکەری مشکی کۆمپیوتەرەکەت بیەیتە سەر ئەو دووگمانەی کە بەستەرمان بۆ کردوون دروستیان دەکەین

ئەو هەنگاوانەی کە تائێستا جێبەجێمان کردووە بۆ یەکێک لە دووگمەکان بووەو یەک بەستەرمان دروستکردووە، دەبێ ئەو هەموو هەنگاوانە جارێکی دیکە جێبەجێ بکەیتەوە بۆ ئەو دووگمەکە یان دووگمەکانی دیکە کە ماون. بەڵام بە ئارەزووی خۆت دەبێت کە چ ڕەنگێک هەڵبژێری پاش هەنگاوی Color Overlay.

پاش ئەوەی کە لەو ئیشانە بە تەواوی تەواو بوویت، دەتوانی ئیشەکەت پاشەکەوت بکەیت، کرتە بکە سەر لیستەی File و پاشان .. Save Optimized As هەڵبژێرە

لە کاتی پاشەکەوتکردندا دەبێ بە فۆرماتی HTML پاشەکەوتی بکەیت

# دروستکردنی دووگمەی بۆماڵپەڕی سایتەکەت

ئەم وانەیە بریتییە لە چۆنیەتی دروستکردنی دووگمەیەک بە شێوەیەکی جوان بۆ ماڵپەڕەکەت .

پێش هەموو شتێک پەڕەیەکی نوێ بکەوە، پانی 125، بەرزی 32 Transparent .و پاشان ok کرتە بکە .

ئامرازی ( لاکێشە ) کێشان دەستنیشان بکە.

پاشان لە سەرەوەش لەسەر تەختەی هەڵبژاردن دا وەک شێوەی خوارەوە ڕێکیبخە

ڕەنگێک هەڵبژێرە بۆ ڕەنگی پێشەوە، من ڕەنگی سوورم هەڵبژاردووە .

پاش ئەو دوو هەنگاوەی سەرەوە شێوەی دووگمەکە بکێشە، پاش ئەوەی کە کێشات لە تابلۆی چینەکاندا بە دەستی ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەت کرتەیەک بکە سەر چینی شێوەکە پاشان Rasterize Layer کرتە بکە.

ئێستا دەڕۆینە سەرەوە بۆ لیستەی چین Layer و لەوێدا کرتە Layer Style دەستنیشان دەکەین و پاشان Drop Shadow کرتە دەکەین، وەک ئەم شێوەیەی خوارەوە ڕێکیبخە،

ئەمجارەشیان کرتە دەکەینە سەر Inner Shadow و وەک لە خوارەوە ڕوونکراوەتەوە، ڕێکیبخە،

تا ئێستا دەبێ شێوەی دیوەی دووگمەکە وەک ئەمەی خوارەوە بێت.

ئەم هەنگاوانەی کە ئێستا جێبەجێیان دەکەین، زۆر گرنگن زۆر جوانی دەبەخشن بە دووگمەکە.

ئێستا لە هەمان شوێندا مەبەستم Layer Style ، کرتە بکە سەر InnerGlow و وەک شێوەی خوارەوەی لێبکە.

تەنیا دوو هەنگاومان ماوە، ئەو دوو هەنگاوەش گرنگترین هەنگاون لەم وانەیەدا.
ئەمجارەیان کرتە دەکەینە سەر Bevel and Emboss و لەویدا خاڵەکانی وەک شێوەی خوارەوە لێدەکەین.

له خوارەوەی Bevel and Emboss دا کرتە دەکەینە سەر Contour و خاڵەکانی وەک شێوەی خوارەوە ڕێکدەخەین،

ئەو هەنگاوەی سەرەوە هەنگاوی کۆتایی هێنان بەم وانەیە بوو، ئێستا دەتوانی OK کرتە بکەیت،

شێوەی دووگمەکە،